**پێشەکی:-**

فەحسی تاقیگەیی کردارێکی پزیشکییە تێیدا کەسی پسپۆڕ و شارەزا هەڵدەستێت بە وەرگرتنی نمونەیەک لە خوێن یان میز یان پیسایی یان لیک یان هەر ماددە و شانە و فلودێکی دیکەی لەش بۆ مەبەستی پشکنین و لێکۆڵینەوە و وەرگرتنی زانیاری دەربارەی تەندروستی کەسەکە ، هەندێک لە فەحسەکان زانیاری وورد و دەقیق دەبەخشێت بە پزیشک دەربارەی حاڵەتێکی دیاریکراو وە هەندێک فەحسی دیکەش زانیاری گشتیمان پێ دەبەخشێت دەربارەی تەندروستی کەسەکە ، لەهەموو ئەم حاڵەتانەدا دەرئەنجامی فەحسەکان یارمەتیدەری پزیشک دەبن لە دۆزینەوەی هۆکاری نەخۆشی تێکچونەکان و بڕیاردان لەسەر پێدانی چارەسەرێکی گونجاو.

لە تاقیگەدا کۆمەڵێکی بەرچاو لە ئامێر و پێداویستی هەیە کە هەریەکەیان . بە کەسی نەخۆش ڕۆڵ و کاریگەری گرنگی هەیە ، بەشێوەیەکی ئاسایی بەشێکی زۆری فەحسە تاقیگەییەکان لەڕێگەی وەرگرتنی نمونەیەک لە خوێن ئەنجامدەدرێت نمونەی ئەم خوێنەش دەکرێتە تیوبێک یان دەفرێکی تایبەتمەند جۆری ئەم تیوبانە جیاوازن و جیاکراونەتەوە بەپێی جیاوازی ڕەنگیان هەریەکێک لەم ڕەنگانە تایبەتمەندی و جیاوازی خۆی هەیە و بە مەبەست دانراون بەجۆرێک هەریەکەیان بۆ جۆرێکی جیاوازی پشکنین بەکاردێت .

فەحسەکانی تاقیگە بەزۆری ئەنجامدەدرێت لەسەر سیرەم و پلازمای خوێن یان بەشێوەیەکی ڕاستەوخۆ بەبێ ئەوەی تێپەڕبێت بەو قۆناغەدا ، ئەگەر ئێمە پێویستمان بە پلازما بوو بۆ فەحسێکی تاقیگەیی ئەوا پێویستە ئەو تیوبەی بەکاریدەهێنین پێکهاتەی کیمیایی دژە مەیینی تێدا بێت (anticoagulant) ...ژمارە و جیاوازی تیوبەکان پشت دەبەستێت بەوەی کە پێویستمان بەچەند کاتێک پێویست بە سیرەمی خوێن بکات بۆ فەحسێکی تاقیگەیی ئەوا . فەحسی تاقیگەیی هەیە پێویستدەکات کە تیوبێک هەڵبژێرین سەرقاپەکەی ڕەنگی زەرد یان سوور بێت ، چونکە ئەم تیوبانە هیچ بڕێکی دژە خوێن مەیینی تێدا نییە ، بۆیە دەبێت کرداری مەیین ڕوبدات بۆئەوەی سیرەم جیابێتەوە و دوای ئەوە بخرێتە ناو ئامێری جیاکردنەوە واتە centrifugation بکرێت بۆ کۆکردنەوەی سیرەم بۆ فەحسی دیاریکراو.

کاتێک بە مەبەست یان بێ مەبەست تیوبێکمان هەڵبژارد کە دژە خوێن مەیینی تێدا بوو ئەوا لەدوای ئەوەی کردمانە ناو ئامێری جیاکردنەوەکە Centrifuge ئەوا پلاسمامان دەستدەکەوێت ، مەیین دەبێتە هۆی ڕوودانی هەڵە لەهەندێ فەحسی تاقیگەیی لەبەرئەوە لەکاتی ئەنجامدانی فەحسە بیۆ کیمیاییە . پێویستدەکات پلازما بەکاربهێنین بۆ ڕێگریکردن لەوە رۆتینەکاندا پێویستدەکات تیوبێک بەکاربهێنین کەجۆرێکی دیارکراو لە ماددەی دژە مەیینی تێدا بێت ئەویش بریتییە لە (Lithium heparin) ...

فەحسی گشتی خوێن CBC پێویستە دژە خوێن مەیینی (EDTA) ئەگەر پێویستت بە شیکردنەوەی فاکتەرەکانی خوێن مەیاندن . تێدابێت بوو ئەوا هەڵبژاردنی تیوبێکی سەرقاپ شین گونجاوە کە سۆدیۆم سیترەیتی تێدابێت...

(Sodium citrate) ، لەبەرئەوە زۆر گرنگە ڕەنگە جیاوازەکان و بەکارهێنانەکانی هەریەکێکیان بزانین بۆ فەحسێکی دیاریکراو هەتا ئەوەی دەرئەنجامێکی ڕاست و دروستمان لە پشکنینەکەوە دەست بکەوێت ، تیوبی سەرقاپ سور و زەرد بۆ کۆکردنەوەت سیرەم بەکاردێت ، ئەگەر تیوبەکە ماددەی (Lithium heparin) ی تێدا بێت ئەوا پێویستە سەرقاپی تیوبەکە سەوز بێت ، بۆ فەسی گشتی خوێن CBC یان Hemogram تیوبی تایبەت کە فاکتەری دژە مەیینی EDTA هەموو . تێدایە سەرقاپی تیوبەکە ڕەنگی ئەرخەوانی یان پەمەییە ئەم ڕەنگانە زۆر یارمەتیدەردەبن بۆ پزیشک و کەسی پسپۆڕی تاقیگەیی لە هەڵبژاردنی .تیوبێکی گونجاو بۆ فەحسێکی دیاریکرا



فەحسی ئەلبۆمین لەڕێگەی خوێن

**Albumin blood test (ALB)**

لەم فەحسەدا ڕێژەی ئەلبۆمین دیاریدەکرێت لە خوێندا ، ئەلبۆمین پرۆتینێکە دروستدەکرێت لەلایەن جگەر ، ئەلبۆبین فرمانی پاراستنی شلەو فلودی ناو جۆگەی خوێنە بەشێوەیەک ڕێگەدەگرێت لە لێچونی ئەو شلەو ئاوەی ناو خوێن کە بچێتە ناو شانەکانی دەوروبەر ، هەروەها هەڵگری چەندین ماددەی دیکەی جۆراوجۆرە لەناو خوێندا وەک هۆرمۆنەکان و ڤیتامینەکان و ئەنزایمەکان ، بۆیە کەمبوونی ڕێژەی ئەلبۆمین دەرخەری ئەوەیە کە کێشە لە جگەر و گورچیلەکاندا هەیە .

ئەم فەحسە بۆچی بەکاردێت؟

ئەم (test) (Liver function) ئەم فەحسە یەکێکە لە فەحسەکانی هەڵسەنگاندنی فرمانی جگەر کۆمەڵێک فەحسن کە دەکرێن لە ڕێگەی وەرگرتنی نمونەیەک لە (Liver function tests) فەحسانە .خوێن بۆ پێوانی ڕێژەی پرۆتین و ئەنزایمەکانی جگەر کە یەکێک لەوانە بریتییە لە ئەلبۆمین لە کاتێکدا دکتۆر گوومانی نەخۆشییەکانی جگەر و گورچیلەی کرد بۆ نەخۆشێک ئەوا ئەم فەحسە یەکێکە لەو فەحسانەی کە بەکاریدێنێت بۆ تشخیص و دیاریکردنی نەخۆشییەکەی نیشانەکانی نەخۆشی جگەر و گورچیلەکان ئەمانەن :-

نیشانەکانی نەخۆشی جگەر *

زەردوویی ، حاڵەتێکە نەخۆشەکە ڕەنگی پێست و چاوی بەرەو زەردبوون دەڕوات :-

لاوازی و کەم توانایی

کەمبوونی کێش

نەمانی ئارەزووی خواردن

تاریکبوونی ڕەنگی میز

زەردباوبوونی ڕەنگی پیسایی

نیشانەکانی نەخۆشی گوورچیلەکان*

ئاوسانی دەوروبەری سک ، یان ڕان و دەم و چاو

زوو زوو میزکردن بەتایبەت لە شەواندا

میزی خوێناوی یان ڕەنگی وەک قاوەیی وایە

دڵ تێکەڵهاتن

خورانی پێست

ئەنجامی ئەم فەحسە دەرخەری چییە؟
ئەگەر ڕێژەی ئەلبۆمین کەمتربوو لە ڕێژەی ئاسایی خۆی ئەوا دەرخەری ڕوودانی یەکێک لەم حاڵەتانەیە :-

(Cirrhosis)نەخۆشی جگەر
نەخۆشی گورچیلەکان
خراپی لە سیستمی خۆراکی
نەخۆشی غوددە
هەوکردن و التهاباتی ڕیخۆڵەکان

بەڵام ئەگەر ڕێژەی ئەلبۆمین زیاتربوو لە ڕێژەی ئاسایی خۆی ئەوا لەوانەیە ووشکبونەوە ڕویدابێت ، واتە کەمبونی فلود و شلەی لەش ،یان سکچوونێکی زۆر توونە دەبێتە هۆی بەرزبونەوەی ڕێژەی ئەلبۆمین ، بەڵام لەگەڵ ئەوانەشدا مەرج نییە هەموو کات ئەنجامی نائاسایی لە ڕێژەیی ئەم فەحسە دەرخەری نەخۆشی بێت ،چونکە بەکارهێنانی هەندێ دەرمان دەبێتە هۆی گۆڕان لەرێژەی ئەلبۆمین بۆ نموونە ستیرۆیدەکان و ئەنسولین و هۆرمۆنەکان دەتوانن ڕێژەی ئەلبۆمین بەرز بکەنەوە ، ئەمە لەکاتێکدا کە هەندێ دەرمانی دیکە وەک حەبی مەنع دەتوانێت ببێتە هۆی کەمکردنەوەی ڕێژەی ئەلبۆمی...
g/dL تێبینی / ڕێژەی ئاسایی ئەلبۆمین 3.5 - 5.5

## فەحسی گشتی خوێن
## .complete blood count (CBC)

( White blood cell ( WBC : یەکەم
خڕۆکە سپییەکانی خوێن بەرگری لە لەش دەکەن دژی هەوکردن ، ئەگەر ماددەیەکی نامۆ بێتە لەش ئەوا هێرشی دەکاتە سەر و لەناوی دەبات، جا بەکتریا بێت یان ڤایروس یان هەر شتێکی نامۆ، قەبارەی خڕۆکە سپییەکان گەورەترە بە بەراورد بە خڕۆکە سوورەکان، بەڵام ژمارەیان کەمترە لە خڕۆکە سوورەکان، بۆیە کاتێک هەوکردن و التهاباتێک لە لەشدا ڕوودات ئەوا ژمارەی خڕۆکە سپییەکان WBC بەشێوەیەکی خێرا زیادد دەکەن، بۆیە ئەگەر لە فەحسدا بینیت WBC زیادی کردووە لە ڕێژەی ئاسای خۆی ئەوا ئاماژەیە بۆ التهابات ..

wbc /microliter... ڕێژەی ئاسای 4500 - 11000
زیاد دەکات WBC ئەو حاڵەتانەی کە تێیدا خڕۆکە سپییەکانی خوێن

١- هەوکردن و التهابات
٢- زیان بەرکەوتن بە شانەکانی لەش وەکو سەکتەی دڵ
٣- پەستانی دەروونی یان بارێکی فیزیای زۆر توونده وەکو (تای بەرز ، برینداری ، نەشتەرگەری)
٤- عجزی گوورچیلە
٥- گوورگە // نەخۆشییەکی پێستە
٦- سیل
٧- هەوکردنی جومگەی روماتیزمی
٨- صرتان بەگشتی و صرتانی خوێن
٩- لابردنی سپڵ
وە هەندێ هۆکاری دیکەش ..

Red Blood Cell ( RBC ) count
خڕۆکە سوورەکانی خوێن هەڵگری ئۆکسجینن کە لە سییەکانەوە دەیگوازنەوە بۆ شانەکانی لەش ، وە لەوێشەوە دوانۆکسیدی کاربۆن دەگێڕنەوە بۆ سییەکان، لە سییەکانیشەوە دەکرێتە دەرەوە لە ڕێگەی ئەوا شانەکانی لەشمان بڕی تەواوی (anemia) کەم بێت RBC هەناسەدانەوە ، ئەگەر ڕێژەی بەرز بێت کە پێی دەڵێین RBC ئۆکسجینی پێناگات کە پێویستییەتی ، وە ئەگەر ڕێژەی ئەمەش وادەکات خڕۆکە سوورەکان پێکەوە بنوسێن وە ئەمەش دەبێتە هۆی (Polycythemia) داخستنێکی بچووکی موولولە خوێنەکان بەمەش گواستنەوەی ئۆکسجین بۆ شانەکانی لەش قورس دەبێت
million cell/microliter ڕێژەی ئاسای لە پیاواندا 6.1-4.7
4.2-5.4وە لە ئافرەتاندا ئەو حاڵەتانەی کە خڕۆکە سوورەکانی خوێن RBC زیاد دەکەن :-

١ - ئەوانەی جگەرە کێشن
٢ - نەخۆشی درێژ خایەنی سییەکان
٣- نەخۆشی گوورچیلە
٤ - نەخۆشی جگەر
٥ - هەندێک لە شێرپەنجەکان
٦ -زۆر خواردنەوەی ئەلکهوول
٧ -ئەو حاڵەتانەی کە پەیوەندی بە شلەی لەشەوە هەیە، وەک ووشکبونەوە ، ڕشانەوە سکچوون ، ئارەقکردنەوەیەکی زۆر ،هەروەها بەکارهێنانی میزپێکەرەکان ، واتە لەم حاڵەتانە کە شلەو فلوودی لەش کەمدەکات RBC زیاد دەکات. .

Platelet (thrombocyte) count (PLT)

پەڕەکانی خوێن بچووکترین جۆری خانەکانی خوێنە، کە گرنگە بۆ مەیینی خوێن ،کاتێک خوێن بەربوون ڕوودەدات پەڕەکانی خوێن گەورە دەبن و پێکەوە تۆپەڵ دەبن ، بەمەش وادەکەن خوێن بەربوونەکە بوەستێنن ،بۆیە ئەگەر ژمارەی پەڕەکانی خوێن کەم بێت ئەوا تواناى کۆنترۆڵ و مەیینی خوێن بەربوون کەمدەبێتەوە، هەروەها ئەگەر ڕێژەکەشی زۆر بێت ئەمەش کێشە دروست دەکات چوونکە دەبێتە هۆی مەیینی خوێن لە لوولە خوێنەکاندا ، هەروەها زۆری پەڕەکانی خوێن لەوانەیە ببێتە هۆی ڕەقبونی خوێنبەرەکان..(atherosclerosis)
ڕێژەی ئاسایی : 150,000- 450,000 platelet/microliter

ئەگەر لە 450,000 زیاتر بێت پێی دەڵێین..
thrombocytosis

وە ئەگەر لە 150,000کەمتر بێت پێی دەڵێین..
thrombocytopenia

حاڵەتەکانی زیادبوون و کەمبوونی پەڕەکانی خوێن،
(Platelet)

یەکەم : ئەو حاڵەتانەی پەڕەکانی خوێن زیاددەکەن..
١ - خوێن بەربوون.
٢ - کەمبوونی ڕێژەی ئاسن.
٣ - هەندێک نەخۆشی وەک شێرپەنجە.
٤ - یان بوونی کێشە لە مۆخی ئێسک (خانە قەدیەکانی دروستبوونی خوێن.(

دووەم :- ئەو حاڵەتانەی پەڕەکانی خوێن کەمدەکات..
١-  لە کاتی دووگیانی.
٢- گەورەبوونی سپڵ .
یان هەر حاڵەتێکی دیکە کە ببێتە هۆی لەناوبردنیplatelet

Hematocrit (HCT) or Packed cell volume (PCV)

ئەم فەحسە بڕی خڕۆکە سوورەکان دیاری دەکات کە لەناو خوێندا هەیە، واتە ئەو بۆشاییەی کە خڕۆکە سوورەکان داگیریان کردووە لە کۆی گشتی خوێندا ، بۆ نموونە ئەگەر HCT ڕێژەکەی 38 بێت ، ئەوا مانای وایە خڕۆکە سوورەکان 38% ی قەبارەی خوێنیان داگیر کردووە، بۆیە HCT فەحسێکی گرنگە بۆ زانینی کەمخوێنی و زۆر خوێنی...

ڕێژەی ئاساییەکەی:

لە پیاواندا: 40-50

لە ئافرەتاندا : 36-46

---

کۆمەڵێک زانیاری دیکە لەسەر فەحسی گشتی خوێن ... CBC

ئەمانەی باسی دەکەین پەیوەندی بە خڕۆکەسوورەکانەوە هەیە RBC ،

Mean Corpuscular Volume (MCV)

Mean Corpuscular Hemoglobin(MCH)

Mean Corpuscular Hemoglobin Concentration (MCHC)

ئەوەی یەکەمیان MCV قەبارە و حەجمی خڕۆکە سوورەکان نیشان دەدات،وە ئەوەی دووەمیان MCHتێکڕای بڕی هیمۆگلوبینە لە ناو خڕۆکە سوورەکاندا،ئەوەی سێیەم MCHC تێکڕای چڕی و خەستی هیموگلوبینە لەناو خڕۆکە سوورەکاندا،ئەم فەحسانە یارمەتیمان دەدەن لە دەستنیشانکردنی جۆرە جیاوازەکانی کەمخوێنی ..

Red cell Distribution Width (RDW)

ئەمەش ئەوە نیشان دەدات ئەگەر خانەکان هەموویان وەک یەک بن یان جیاواز بن لەڕووی قەبارە و شێوەوە.

ڕێژەی ئاساییان:

MCV: 83-101

MCH: 27-32

MCHC: 31.5-34

RDW: 11.6-14

---

چەند تێبینییەک لەسەر فەحسی گشتی خوێن CBC

١- ئەو تۆرنیکایەی یان ئەو لاستیکەی کە دەستی پێدەبەستیت ئەگەر بۆ ماوەیەکی زۆر بیبەستی ئینجا خوێنەکە وەربگریت,ئەوا ئەنجامەکەی باش دەرناچێت ، واتە هەڵەیە بەو شێوەیە.
٢- ژمارەی خڕۆکە سپییەکان WBCدەگۆڕێت لە کاتی وەرزش و سترێس و ئەوانەی جگەرەکێشن.
٣- لە منداڵدا ژمارەی خڕۆکە سپییەکان زیاترە ئاساییانە بە بەراورد بە گەورە .
٤- وەرگرتنی هەندێ دەرمان دەبێتە هۆی کەمبوونی پەرەکانی خوێن Low platelet levels ،وەک و ستیرۆید ، وە هەندێ جۆری antibiotic ،...هتد...
٥- ئەگەر ڕێژەی خڕۆکە سپییەکان و چەوری لە جۆری Triglycerides زۆر بەرز بێت ، ئەمە دەبێتە هۆی ئەوەی بەشێوەیەکی هەڵە ڕێژەی هیمۆگلوبین بەرزبێتەوە،،.
٦- وە ئەگەر سپڵ گەورە بوو ، ئەوا وادەکات ڕێژەی پەرەکانی خوێن کەم بێت،.
٧- ئەوانەی دووگیانن Pregnancy ئەوا بە ئاساییانە ڕێژەی خڕۆکە سوورەکانیان کەمە. RBC

---

بۆ فێربونی خوێندنەوەی فەحسی میز، زانیاری و دەرئەنجامەکان لەسەر فەحسی میز بزانە..
*سەرەتا ڕێژەی میزی ئاسایی 2500 ml - 800 لە ٢٤ کاتژمێردا.. ئەمەش زانیاریەکان...

١- ڕوونی :(Clariety) میز دەبێت ڕوون بێت، بەو مانایە نا کە بێڕەنگ بێت، بە شێوەیەکی ئاساییClearبێت ، بەڵام بەکتریا و خوێن و کریستاڵ.... ئەمانە میز تەڵخ و ناڕوون دەکەن.

٢- پرۆتین :(Protein) بەشێوەیەکی ئاسایی دەبێت بە هیچ شێوەیەک پرۆتین نەبێت لە میزدا ،واتە سفر بێت ، بەڵام هەندێ هۆکار دەبنە هۆی درووستبونی پرۆتین لە میزدا وەک .. بەرزبوونەوەی پلەی گەرمی لەش (تا)، حاڵەتی دووگیانی ،وەرزش و چالاکی زۆر توند ،بەرزی پەستانی خوێن، شەکرە، هەندێ نەخۆشی بەتایبەت نەخۆشی گوورچیلە.

٣- کێشی جۆری:(Specific gravity) ئەمە بڕی ئەو ماددانە دەردەخات کە لە میزدا هەیە ، هەروەها هاوسەنگی گورچیلەکان و بڕی ئەو ئاوەی کەلە میزدا هەیە، بەرزی ڕێژەی ئەم فەحسە دەرخەری ئەوەیە کە بڕێکی زۆر ماددەی نیشتوو(ڕەق)لە میزدا هەیە ، وە کاتێک ئاوێکی زۆر بخۆیتەو ئەوا ڕێژەی ئاو لە میزدا زۆر دەبێت بەمەش ژمارەکە کەمدەبێتەوە ،بەڵام کاتێک ئاو کەم بخۆیت ئەوا گوورچیلەکان میز بەرهەم دێنێت کە بڕێکی کەمی لە ئاو پێکدێت، بەمەش ژمارەی Specific gravityبەرز دەبێتەوە، ڕێژەی ئاسایی (1.030 - 1.005).

٤- ناوەندی :(PH) ترشێتی و تفتێتی میز دیاری دەکات،بۆنمونە ئەگەر ٤ بێت ئەوا میز ناوەندێکی ترشی بەهێزە ، ئەگەر ٧ بێت ئەوا هیچیان نییە ، وە ئەگەر ٩ بێت ئەوا تفتێکی بەهێزە ، وە زۆر جار دکتۆر هاوسەنگی ترشێتی و تفتێتی بەکاردێنێت بۆ ڕێگری کردن لە درووستبونی بەردی گوورچیلە، ڕێژەی ئاسایی (4.6 – 8)

٥ -گلوکۆز :(Glucose) جۆرێکی شەکرە کە بەشێوەیەکی ئاسایی دەبێت ڕێژەکەی زۆر کەم بێت یان هەر نەبێت لەمیزدا ، بەڵام ڕێژەیەکی بەرزی گلوکۆز دەرخەری ئەوەیە کە شەکرە کۆنترۆڵ نەکراوە ، هەروەها نەخۆشی گوورچیلەش هەندێ جار دەبێتە هۆی بەرزبوونەوەی گلوکۆز لە میزدا،ڕێژەیی ئاسایی 1 - mg/dl.15..

٦- : Nitritesکاتێک ڕێڕەوی میزەڕۆ التهابات دەکات UTI ، ئەوا ئەنزیمێک درووست دەبێت دەبێتە هۆی گۆڕانی Nitrates ی میز بۆ Nitritesوە بوونی Nitrites لە فەحسی میزدا ئەوا دەرخەری ئەوەیە کە ڕێڕەوی میزەڕۆ التهاباتی هەیە.

٧- : WBC esterase بوونی ئەمەش هەر دەرخەری ئەوەیە کە ڕێڕەوی میزەڕۆ التهاباتی هەیە.

٨- کیتۆن :(Ketones) کاتێک چەوری تێکدەشکێت و دەگۆڕێت بۆ ووزە ، ئەوا ماددەیەک دروست دەبێت پێی دەڵێین کیتۆن ، بەرزی ڕێژەی کیتۆن لە میزدا دەرخەری حاڵەتی مەترسیدارە ، هەروەها نیشاستە و کاربۆهیدرات و رشانەوەی تووند دەبێتە هۆی زیادبوونی کیتۆن لە میزدا.

٩ -ڕەنگی میز : Color ڕەنگی ئاسایی میز زەردێکی کاڵ ، کەمێک زەردیەکەی چڕ بێت کێشەی نییە، لەخوارەوە سەرجەم گۆڕانەکانی ڕەنگی میز و هۆکارەکانیمان باس کردووە ..
فەحسێکی دیکەی میز بریتییە لە :Microscopic analysis لەم جۆرە فەحسەیاندا لە ئامێرێکدا Centrifugeکە میزەکە دەسوڕێنێتەوە و ماددە ڕەقەکانی ناوی دەنیشێت و دواتر ئەم ماددانە لەژێر مایکرۆسکۆبدا سەیر دەکرێت بۆ ئەم ئەنجامانەی خوارەوە:
خڕۆکەی سوور یان سپی:RBC or WBC
بەشێوەیەکی ئاسایی نابێت لە میزدا خوێن هەبێت ، بەڵام التهابات و نەخۆشی یان برینداربوونی گوورچیلە ،میزەڵان ، بۆری میز، دەبێتە هۆی درووستبوونی خوێن لە میزدا، هەروەها ڕاکردنی زۆر (ماراسۆن) ، دەبێتە هۆی ئەم حاڵەتە.
کریستاڵ یان ڕمڵ: Crystal کەسێکی تەندرووست بڕێکی کەم کریستاڵ هەیە لە میزیدا ، بەڵام ئەگەر زۆر بوو ئەوا دەرخەری بەردی گوورچیلەیە.
بەکتریا و مشەخۆر:Bacreia &Parasites بەشێوەیەکی ئاسایی نابێت لە میزدا هەبێت ، بەڵام ئەگەر هەبوو ئەوا دەرخەری التهابات و هەوکردنە.
Casts
هەندێک جۆری نەخۆشی گوورچیلە دەبێتە هۆی دروستبونی ماددەیەک پێی دەڵێین Casts ئەمە یارمەتیمان دەدات لە دەستنیشانکردنی جۆری نەخۆشی گوورچیلەکان.
ئەو هۆکار و حاڵەتانەی کە تێیدا ڕەنگی میز دەگۆڕێت.
١- ئەگەر زەردێکی کاڵ بێت ئەوا تەندرووستە.
٢- ئەگەر زەردێکی تۆخ و چڕ بێت ، هەر بە ئاسایی دادەنرێت ، بەڵام کەمێک بە ووشکبوونەوە دادەنرێ، واتە بڕێکی باش ئاو ناخۆیتەوە.

٣- ئەگەر پرتەقاڵی بێت ، ئەوا ووشکبوونەوە هەیە ، واتە بڕێکی لەم ئاو شلەمەنی لەلەشدا هەیە ، یان لەوانەیە کێشەیەک لەجگەردا هەبێت، یان لەوانەیە بەهۆی خواردنی هەندێ خواردنەوە بێت، بەڵام لەکاتی بەیانیان کاتێک ڕەنگی میز گۆڕاوە ئەوە ئاساییە ، چوونکە ماوەی چەند سەعاتێکە خەوتویت و هیچ فلودێک یان شلەیەکت نەخواردووە ، بەڵام ئەگەر بە درێژای ڕۆژ وابێت ئەوا ئاسایی نییە و دەبێت بڕێکی باش فلوود و شلەمەنی بخۆی.

٤- ئەگەر قاوەی بوو ، ئەوا زۆر بە توندی ووشکبوونەوە ڕوویداوە لەلەشدا ، واتە ئاو و فلودی لەش زۆر کەمە، یان نەخۆشی جگەرت هەیە.

٥- ئەگەر نزیک سوور یان سوور بوو ، ئەوا میزەکەت خوێنی پێوەیە پێویست بە چارەسەری دەکات واتە خوێن هاتۆتە ڕێڕەوی میز لەناو گوورچیلەکانەوە یان ڕێڕەوی میزەڕۆ ، ئەمەش بەهۆی بوونی التهاباتی میزەڕۆ، التهاباتیش بەهۆی بەکتریا ڕوودەدات ، یان لەکاتی بەردی گوورچیلە، بەڵام خواردنی هەندێک خواردنیش لەوانەیە هۆکار بن ، بۆ نموونە چەوەندەر...

٦- بەڵام ئەگەر بێ ڕەنگ و ڕوون بێت ، ئەوا بڕێکی زۆر ئاو و فلوود بەکاردێنی و لەلەشدا هەیە..
٧- هەروەها لە کاتێکدا هیموگلوبین تێکدەشکێت ڕەنگی میز لەوانەیە بۆ جۆرەها ڕەنگ بگۆڕێت وەک ، سوور و قاوەیی و سەوز ...هتد
لەگەڵ هەموو ئەم حاڵەتانەشدا وەک ووتمان زۆرجار گۆڕانی ڕەنگی میز پەیوەندی بەو خواردنانەوە دەبێت کە دەیخۆین ، یان بەکارهێنانی هەندێ دەرمان ڕەنگی میز دەگۆڕێت..

---

## شیکردنەوەی داتاکانی فەحسی پیسایی
## Stool analysis

ئەم فەحسە بە وەرگرتنی نموونەیەک لە پیسایی ئەنجامدەدرێت بۆ زانی ی حاڵەت و تێکچوونەکانی پەیوەست بە کۆئەندامی هەرس ..

١- پیسایی ڕەنگی قاوەییە ئاسایی ئەمەش بەهۆی ئەوەی کاتێک خڕۆکە سوورەکان تێکدەشکێن یان تەمەنیان کۆتای هاتووە ئەوا بەشێکی لەڕێگەی پیسایی دەکرێتە دەرەوەBilirubin، وە پیسایی دەبێت نەرم بێت ،بەڵام ڕەنگەکانی ڕەش و زەرد و سوور و سپی و سەوز نائاساییین،ڕەنگی سەوز زۆرجار بەهۆی خواردنەوەیە وەک سپێناخ،ئەگەر زەرد بێت ئەوا لەوانەیە التهابات بێت یان ڕیخۆڵە زیاد لە پێویست چالاک بێت ،ئەگەر سپی بێت ئەوا bile لە جگەردا کەم درووست دەبێت،ئەگەر ڕەش بێت ئەوا لەوانەیە بەشی سەرەوەی کۆئەندامی هەرس توشی خوێن بەربوون بوبێت ،ئەگەر شین بێت زیاتر لە منداڵدا ئاماژەیە بۆ ناساغی یان هەندی خواردن، هەروەها ئەگەر پیسایی زۆر شل بێت یان زۆر ڕەق هەر نائاساییە.

٢ - پیسای بەشێوەیەکی ئاسایی نابێت خوێن و لینجە ماددە و ڕیشاڵی هەرس و جەراعەتی پێوە بێت،چوونکە ئەگەر خوێنی پێوە بێت ئەوا لەوانەیە ڕێڕەوی هەرسی توشی خوێن بەربوون بووبێت ، هەروەها ئەگەر ماددەی هەرسنەکراوی پێوە بێت ئەوا لەوانەیە پەنکریاس التهاباتی هەبێت.

٣ - ناوەندی ترش و تفتی PH ،بەشێوەیەکی ئاسایی دەبێت لە نێوان 7 - 7.5 بێت ، ئەگەر لەو ژمارەیە کەمتر یان زیاتر بوو ئەوا نائاساییە،بۆ نموونە ئەگەر لە 7 کەمتر بێت ئەوا لەوانەیە هۆکارەکەی لاوازی لەمژینی کاربۆهیدرەیت و چەوری بێت،بەڵام ئەگەر PH لەو ڕێژە ئاساییەی خۆی زیاتر بێت ئەوا لەوانەیە هەوکردنی ڕیخۆڵەکان بێت یان antibiotic بەکاربێنیت (دەرمانی التهابات)

٤- دەبێت ڕێژەی گلوکۆز لە 0.25 g/dl کەمتربێت ، کەپێی دەڵێین Reducing factors ، بەرزی لەڕێژەی Reducing factor ئەگەر 0.25 یان زیاتر بێت ئەوا لەوانەیە کێشەی لە سیستمی هەرسکردنی هەندێ جۆری شەکردا هەبێت، هەروەها ئەگەر ڕێژەکەی لەوە کەمتر بێت ئەوا لە ئەنجامی خراپ خۆری یان هەندێ دەرمان وەک...Colchicine دروست دەبێت.

٥- ڕێژەی ئاسای چەورییە ماددە Fat دەبێت لە 2-7 g/24h بێت ،بەڵام ئەگەر ڕێژەکەی بەرزتر بوو ئەوا دەگەڕێتەوە بۆ هەندێ نەخۆشی وەک هەوکردنی پەنکریاس یان ناتەواوی هەرس ..هتد

٦- ئەگەر خرۆکەی سپیWBC لە پیساییدا هەبێت ، ئەوا دەرخەری ئەوەیە کە التهاباتی ڕیخۆڵەکانی هەیە یان برین و هەوکردنی پەردەی ڕیخۆڵە کوێرە یان هەر التهاباتێکی بەکتریایی.

٧- ئەگەر لەم فەحسەدا Rotaviruses دەرکەوت ئەوا نیشانەی سکچوونە بە تایبەت لە منداڵاندا.
*ئەو هۆکارانەی کە وادەکەن ئەم فەحسە ئەنجامەکەی باش و یارمەتیدەر نەبێت یان ڕاست دەرنەچێت بریتییە لە هەندێ دەرمان وەک گرووپی دژەهەوکردنەکان antibiotics یان دژە سکچوونەکان antidirrhea یان مەگنسیوم یان بە گشتی Nonsteroid anti-inflammatory drugs NSAIDs

---

فەحسی بیلیروبین (Bilirubin test )

(Jaundice) لەڕێگەی خوێ بۆ دیاریکردنی زەردوویی
باسی بیلیروبین ،ڕێژەی ئاسایی، بۆچی ئەم فەحسە دەکرێت، زەردووی هۆکارەکانی چییە، چەندەها زانیاری دیکەش ...
ئەم فەحسە بۆ دیاریکردنی ڕێژەی بیلیروبینە لە خوێندا ، بیلیروبین ڕەنگێکی زەردباوە لە ناو شلەی بایڵ ، کە ئەم شلەیە جگەر درووستی دەکات ...
وە باشتر وایە پێش ئەوەی ئەم فەحسە ئەنجام بدەیت بۆماوەی چوار سەعات پێشتر هیچ خواردن و خواردنەوەیەک نەخۆیت.
وەک دەزانن خڕۆکە سوورەکان تەمەنیان هەیە ، دوای تەواوبونی تەمەنیان خرۆکەی سووری نوێ جێگەیان دەگرێتەوە، جگەر یارمەتی تێکشکاندن و کردنەدەرەوەی ئەم بیلیروبینە دەدات بۆ دەرەوەی لەش لەڕێگەی پیسایی و میزەوە.
بەرزی ڕێژەی بیلیروبین لە لەشدا دەبێتە هۆی زەردوویی ، کە ئەمەش زەردبوونی ڕەنگی پێست و چاوە
ڕێژەی ئاسایی کۆی بیلیروبین لە لەشدا بریتییە لە :-
0.3 - 1.9 mg/dL
وە ئەم ڕێژە ئاساییە لەوانەیە کەمێک بگۆڕێت لە تاقیگەیەکەوە بۆ تاقیگەیەکی دیکە ، وە بەپێی وەرگرتنی نموونەکە
هۆکارێک بۆ ڕوودانی زەردوویی و زیادبوونی ڕێژەی بیلیروبین بریتییە لە تێکشکانی خڕۆکە سوورەکان زیاد لە ڕێژەی ئاسایی خۆی، ئەمەش بەهۆی چەند هۆکارێکەوە :-

-نەخۆشیەکانی خوێن ، کە پێیان دەڵێینErythroblastosis fetalis
-ناتەواوی و نەخۆشیەکانی خڕۆکە سوورەکان کە پێی دەڵێینHemolytic anemia
-یان لە کاتی گواستنەوەی خوێن لە کەسێکەوە بۆ کەسێکی دیکە ، لەلایەن سیستمی بەرگری کەسی وەرگرەوە خڕۆکە سوورەکان تێکبشکێنرێت.
هەروەها نەخۆشیی و ناتەواویەکانی جگەر دەبێتە هۆی زەردوویی و زیادبوونی ڕێژەی بیلیروبین وەک ئەمانەی خوارەوە:
- بریندداربوون یان نەخۆشی درێژخایەنی جگەر.
- هەوکردن و التهاباتی جگەر.
- وە نەخۆشیەکانی دیکەی جگەر.

هەروەها هەندێ حاڵەت کە لە زراو و ڕێڕەوی زراودا ڕوودەدەن لەوانەیە ببنە هۆی زەردوویی وە ئەمانەی خوارەوە:

- تەسک بوونەوەی نائاسایی ڕێرەوی بایڵ لا زراو.
- شێرپەنجەی پەنکریاس یان زراو.
- بەردی زراو.

*لە منداڵی تازە لەدایکبوودا ڕێژەی بیلیروبین بەرزە لە ڕۆژە سەرەتاکانی تەمەنیدا،وە دەبێت لێرەدا دکتۆرەکە ڕەچاوی چەند خاڵێک بکات لەسەر.. ئەمە ، بۆ نموونە خێرای ڕێژەی بەرزبوونەوەکەی... چەندە و چۆنە ،وە تەمەنی منداڵەکە ، یان ئەگەر منداڵەکە پێش وەخت لەدایکبووبێت ، ئەمانە ئیشی دکتۆرەکەیە کاری لەسەر بکات...

---

# ALT blood test

alanine transaminase (ALT)
ئەنزیمێکە بەزۆری لە جگەردا هەیە ، ئەم فەحسەش یەکێکە لە فەحسەکانی هەڵسەنگاندنی فرمانی جگەر ، بۆیە کاتێک خانەکانی جگەر تێکبشکێن و زیانیان بەربکەوێت ئەوا ئەم ئەنزیمە (ALT) دەچێتە ناو ڕێڕەوی خوێن ، ئەم فەحسەش کە دەکرێت بۆ پێوانەکردنی ڕێژەی (ALT) لەناو خوێندا ، بۆیە بەرزی لەڕێژەی ئەم فەحسە دەرخەری کێشە و نەخۆشییە لە جگەردا ، بۆیە لەکاتی دەرکەوتنی نیشانەکانی نەخۆشی تێکشکانی خانەکانی جگەر دکتۆر کۆمەڵێک فەحس پێشنیار دەکات یەکێک لەو فەحسانە بریتییە لە (ALT) ، نیشانەکانی نەخۆشی و تێکشکانی خانەکانی جگەر بەزۆری بریتیین لەمانەی خوارەوە :-

- هێڵنجدان و ڕشانەوە.
- زەردوویی.
- ئازاری سک.
- کەمبوون یان لەدەستدانی ئارەزووی خواردن.
- خورانێکی نائاسایی.
- هیلاکی.

*بەڵام لەو کەسانەی کە مەترسییان زیاترە بۆ نەخۆشییەکانی جگەر ئەوا پێش دەرکەوتنی زۆربەی نیشانەکان لەوانەیە دکتۆر ڕەچاوی ئەم فەحسە بکات ، هەندێک لە مەترسییەکانیش بریتیین لەمانە: (نەخۆشی شەکرە ، قەڵەوی ، بۆماوەیی ، زۆر خواردنەوەی ئەلکهول ، بەکارهێنانی هەندێک دەرمان.....

---

# AST blood test

Aspartate aminotransferase (AST)
ئەنزیمێکە بەشێوەیەکی گشتی لە جگەردایە هەروەها لە ماسوولکەخانەکانیشدا هەیە ، کاتێک جگەر نەخۆش بێت یان بەباشی ئیش نەکات ئەوا ڕێژەی (AST) دەچێتە ڕێڕەوی خوێن و ڕێژەکەی تێیدا بەرزدەبێتەوە.

بۆیە بەرزی لەڕێژەی ئەم فەحسە دەرخەری کێشە و نەخۆشییە لە جگەردا ، بۆیە لەکاتی دەرکەوتنی نیشانەکانی نەخۆشی تێکشکانی خانەکانی جگەر دکتۆر کۆمەڵێک فەحس پێشنیار دەکات یەکێک لەو فەحسانە بریتییە لە (AST) ، نیشانەکانی نەخۆشی و تێکشکانی خانەکانی جگەر بەزۆری بریتیین لەمانەی خوارەوە :-

- هێڵنجدان و ڕشانەوە.
- زەردوویی.
- ئازاری سک.
- کەمبوون یان لەدەستدانی ئارەزووی خواردن.
- خورانێکی نائاسایی.
- هیلاکی.

*بەڵام لەو کەسانەی کە مەترسییان زیاترە بۆ نەخۆشییەکانی جگەر ئەوا پێش دەرکەوتنی زۆربەی نیشانەکان لەوانەیە دکتۆر ڕەچاوی ئەم فەحسە بکات ، هەندێک لە مەترسییەکانیش بریتیین لەمانە: (نەخۆشی شەکرە ، قەڵەوی ، بۆماوەیی ، زۆر خواردنەوەی ئەلکهول ، بەکارهێنانی هەندێک دەرمان.....

دەرئەنجامی ئەم فەحسە:
ئەگەر ڕێژەی (AST) لەخوێندا بەرزبوو ئەوا دەرخەری هەوکردنی جگەر یان نەخۆشییەکانی دیکەی جگەرە ، هەروەها ڕێژەی (AST) پەیوەندیدارە بە کێشەکانی دڵ و هەوکردنی پەنکریاس ،بەڵام هەموو کات نائاسایی بوونی ئەنجامی ئەم فەحسە مەرجی بوونی نەخۆشی ناتەواوی نییە لە

لەشدا بەڵكو جۆرەها هۆكار دەبنە هۆی گۆڕینی ڕێژەی ئەم فەحسە وەک تەمەن و ڕەگەز و خواردن و بەکارهێنانی هەندێ دەرمان...

بۆیە لەکاتی بەرزی ڕێژەی ئەم فەحسەدا ئەنجامی چەند فەحسێکی دیکەش ڕەچاوبکرێت بۆ دیاریکردن و درستنیشانکردنی نەخۆشییەکانی جگەر ، بەتایبەت فەحسەکانی دیکەی هەڵسەنگاندنی فرمانی جگەر وەک..(ALT)

---

فەحسی :- Alkalime Phosphatase (ALP)

ئەم فەحسە پێوانی بڕی ALP یە لە خوێندا ، ALPیان Alkaline phosphatase بریتییە لە ئەنزیمێک کە لەلەشماندا هەیە ، بەڵام بەزۆری هەیە لە جگەر و ئێسک و گوورچیلەکان و سیستمی هەرسکردن ، کاتێک جگەر زیانی بەربکەوێت یان بەباشی فرمانەکانی ئەنجام نەدات ئەوا ئەم ئەنزیمە (ALP) دەچێتە ناو خوێنەوە ، بۆیە بەرزی ڕێژەی (ALP) لە فەحسی خوێندا دەرخەری نەخۆشییەکانی جگەر یان ئێسک.
بۆیە لەکاتێک نیشانەکانی نەخۆشی جگەر و ئێسک دەرکەوت ئەوا پێویستە ئەم فەحسە ئەنجام بدرێت ، نیشانەکانیش بەم شێوەیەن :-

نیشانەکانی نەخۆشی جگەر بریتیین لەمانە :-
- زەردوویی ، حاڵەتێکە نەخۆشەکە ڕەنگی پێست و چاوی بەرەو زەردبوون دەڕوات.
- لاوازی و کەم توانایی.
- کەمبوونی کێش.
- نەمانی ئارەزووی خواردن.
- تاریکبوونی ڕەنگی میز.
- زەردباوبوونی ڕەنگی پیسایی.



"نیشانەکانی نەخۆشییەکانی ئێسک ئەمانەن-:

- بوونی ئازار لە ئێسک یان جوومگەکان.
- گەورەبوون یان نائاسایی بوونی شێوەی ئێسکەکان.
- زیادبوون و دووبارەبوونەوەی شکانی ئێسک.

بۆیە بەرزی ڕێژەی ALP لە فەحسدا دەرخەری یەکێک لەم حاڵەتانەیە لە جگەردا ، وەک :-

- نەخۆشی جگەر جۆری.Cirrhosis
- هەوکردنی جگەر.
- بلۆک بوون یان گیرانی ڕێڕەوی شلەی بایل.(Bile duct blockage)
- حاڵەتی Mononucleosis کە هەندێ جار جگەر دەئاوسێت.

هەروەها لەگەڵ ئەم فەحسەدا چەند جۆرێکی دیکەی فەحس هەیە کە ئەنجامدەدرێت بۆ هەڵسەنگاندی تەندروستی و فرمانی جگەر ، ئەو فەحسانەش بریتین لە بیلیروبین (Bilirubin) و AST و ALT ، ئەگەر لەم ئەنجامی ئەم فەحسانە ئاسایی بوون بەڵام ڕێژەی (ALP ) بەرز بوو ئەوا ئەگەری بوونی نەخۆشی لە جگەردا نییە ، بەڵکوو دەکرێت پەیوەندی بە تێکچوون و نەخۆشییەکانی ئێسکەوە هەبێت ، وەک نەخۆشی Paget's Disease of bone ئەم حاڵەتە دەبێتە هۆی لاوازبون یان هەورەبونی نائاسایی و زوو شکان.

کەمی لە ڕێژەی ئەم فەحسە (ALP) ئەوا نشانەی کەمی فۆسفاتە ، یان هەندێ نەخۆشی بۆماوەیی کە کاربکاتە سەر ئێسک و ددانەکان ، هەروەها کەمی لە ڕێژەی (ALP) لەوانەیە هۆکاری کەمی ماددەی زینک بێت یان خراپی سیستمی خۆراکی و خراپ خۆری.
ڕێژەی ئاسایی ئەم فەحسە (ALP) بریتییە لە : -
( 44 - 147 IU/L ).

لەگەڵ هەموو ئەوانەشدا لە هەندێ حاڵەتدا ڕێژەی ئەم فەحسە (ALP) ئەگۆڕێت ، بۆنموونە لە کاتی دووگیانیدا زۆرجار ڕێژەی ئەم فەحسە بەرزە ، یان لە منداڵاندا چوونکە ئێسکەکانیان لە گەشەدان ، بەڵام بەکارهێنانی حەبی مەنع لەوانەیە ببێتە هۆی کەمی لە ڕێژەی ئەم فەحسە.....

---

# Alpha - Fetoprotein ( AFP ) Test

سەرەتا (AFP) بریتییە لە پرۆتینێک کە لەجگەردا دروستدەبێت لەناو کۆرپەلەی گەشەکردوودا ، لەماوەی گەشەکردنی کۆرپەلەدا لە منداڵداندا ئەوا هەندێک لەم پرۆتینە (AFP) لە ویلاشەوە دەگوازرێتەوە بۆ ناو خوێنی دایکەکە ، بۆیە ئەم فەحسە بەکاردێت بۆ پێوانی ڕێژەی (AFP) لە دایکی دووگیاندا لەماوەی قۆناغی سێیەکی دووەمی سکپڕی .(Second trimester of pregnancy) بۆیە بەرزی یان نزمی لە ڕێژەی (AFP) لە خوێنی دایکەکەدا کاریگەری دەکاتە سە کەم و کوڕی منداڵبونەکە ، وە هەندێ حاڵەت لەوانە :-

- حاڵەتی Neural tube defect حاڵەتێکی مەترسیدارە کە کاریگەری دەکاتە سەر گەشەی مێشکی منداڵەکە و هەروەها دڕکە پەتکی.
- دیاردەی داون Down syndrome کە زیاتر تێکچونێکی بۆماوەییە کاریگەری دەکەوێتە سەر کەم توانای بیر و هۆش و درەنگ کەوتنی گەشە.

بۆیە ئەم فەحسە پێویستە بکرێت لەماوەی دووگیانی بۆ دڵنیابوون لە تەندرووستی کاتی لەدایکبونی منداڵەکە و ڕوونەدانی ئەو حاڵەتانەی کە باسمان کرد ، بۆیە وا باشە کە هەموو ئافرەتێکی دووگیان ئەم فەحسە بکات کە هەندێ کات لە ماوەی 15 بۆ 20 هەفتەیی ماوەی سکپڕی ئەنجامبدرێت ، بەتاییەت ئەگەر ئافرەتی دووگیان ئەم حاڵەتانەی هەبوو...

-شەکرەی هەبوو.
-تەمەنی 35 ساڵ یان زیاتر بوو.
-پێشتر لە خێزانەکەیدا ئەو حاڵەتانە ڕویدابوو ، واتە بۆماوەییانە بوو.

ئەنجامی ئەم فەحسە:-
ئەگەر ئەنجامی ئەم فەحسە بەرزتربوو لە ڕێژەی ئاسایی خۆی ئەوا ئەگەری ناتەواوی لەگەشەی مێشک و کێشەی بڕبڕەکان کە لە منداڵەکادە ڕوودبدات ، بەڵام ئەگەر ڕێژەکەی نزمتربوو لە ڕێژەی ئاسایی خۆی ئەوا ئەگەری ڕوودانی حاڵەتەکانی وەک دیاردەی داون و حاڵەتە جینیەکانی دیکە.
بەڵام مەرج نییە هەموو کات نائاسایی بوونی ئەم فەحسە دەرخەری ناتەواوی گەشەی کۆرپەلە یان ئەو حاڵەتانەی دیکە بێت کە باسمان کردن ، بەڵکو ئەگەر زیاد لە منداڵێک بوو ئەوا ڕێژەکە ئاسایی نابێت ، بۆیە پێویستە لەم کاتانەدا چەند فەحسێکی دیکە بکەیت بۆ دڵنیابوون..

---

فەحسی :-
# Anion Gap

Anion Gap Blood Test
ئەم فەحسە ڕێگایەکە بۆ پشکنینی ڕێژەی ترشی لەناو خوێندا ، ئەم فەحسە بنچینەیە لەسەر ئەنجامی فەحسی دیکە کە ناودەبرێت بە Electrolyte panel ، ئەلیکترۆلایتەکان کانزایی بارگاوی کارەبایین بارمەتی ڕێکخستن و کۆنترۆڵکردنی هاوسەنگی ماددە کیمیاییەکان دەدەن لەلەشدا وەک ترش و تفت.
هەندێک لەو کانزایانە بارگەی کارەبایی پۆزەتیڤن (+) ، وە هەندێکی دیکەیان نیگەتیڤن (-) ، لەڕێگەی فەحسی Anion Gap پێوانەی جیاوازی نێوان ئەلیکترۆلایتە بارگە پۆزەتیڤ و بارگە نیگەتیڤەکان دەکرێت، ئەگەر ڕێژەی Anion Gap بەرز بوو یان نزم بوو ئەوا دەرخەری تێکچون و نەخۆشییە لە سییەکان یان گورچیلەکان یان ئەندامی دیکە.

ئەم فەحسە بۆچی بەکاردێت ؟

ئەم فەحسە Anion Gap بەکاردێت بۆ پیشاندانی ناهاوسەنگی ئەلیکترۆلایتەکان لەناو خوێندا یان بەرزی لەڕێژەی ترش یان نەبوونی ڕێژەی ترش بەشێوەیەکی پێویست. ئەگەر ڕێژەی ترشی ناو خوێن بەرز بێت ئەوا بەم حاڵەتە دەڵێین (Acidosis) ، بەڵام ئەگەر ڕێژەی ترش لە خوێندا بەشێوەیەکی پێویست نەبوو ئەوا زۆرجار حاڵەتەکە ناودەبرێت بە.(Alkalosis)

بۆچی پێویستە فەحسی Anion Gap ئەنجام بدەین ؟

پزیشک زۆرجار ڕەچاوی ئەم فەحسە دەکات کاتێک نیشانە و دەرکەوتەکانی ناهاوسەنگی ڕێژەی ترشێتی ناو خوێن دەرکەوتن ، نیشانەکانیش بریتین لەمانە :-
- هەناسە کورتی.
- ڕشانەوە.
- نائاسایی لێدانی دڵ.
- گێژبوون و سەرشێواوی.

*ئاسایی ئەنجامدانی ئەم فەحسە لەڕێگەی وەرگرتنی نمونەیەک لە خوێن ئەنجام دەدرێت ، وا باشترە چەند کاتژمێرێک پێش ئەنجامدانی ئەم فەحسە هیچ خواردن و خواردنەوەیەک نەخورێت.

دەرئەنجامی ئەم فەحسە دەرخەری چییە؟
ئەگەر لەئەنجامی ئەم فەحسەدا ڕێژەی Anion Gap بەرز بوو ئەوا دەرخەری حاڵەتی (Acidosis) واتە ڕێژەی ترشێتی ناو خوێن بەرزترە لەڕێژەی ئاسایی خۆی.

هەروەها حاڵەتی (Acidosis) لای خۆیەوە زۆرجار بەهۆکاری دیکە ڕودەدات و نیشانە و دەرخەری چەند حاڵەتێکی دیکەیە لەوانە : ووشکبونەوە ، سکچوون ، وەرزشکردنی زۆر ، هەروەها لەوانەیە دەرخەری حاڵەتی دیکەی مەترسیدارتر بێت وەک نەخۆشی گورچیلەکان و نەخۆشی شەکرە.

بەڵام ئەگەر ئەنجامی فەحسی Anion Gap نزم بوو ئەوا دەرخەری نزمییە لەڕێژەی ئەلبۆمین (Albumin)، ئەلبۆمین پرۆتینێکە لەناو خوێندا ، نزمی ڕێژەی ئەلبۆمین لەوانەیە دەرخەری کێشە بێت لە گورچیلەکان و دڵدا یان لەهەندێ جۆری شێرپەنجەدا ، هەرچەندە کەمی ڕێژەی Anion Gap حاڵەتێکی باوو نییە بەڵام لەم کاتانەدا زۆرجار فەحسەکە دووبارە دەکرێتەوە بۆئەوەی دڵنیابێتەوە لە حاڵەتەکەی.

ڕێژەی ئاسایی Anion Gap لە سیرەمی خوێندا بریتییە لە: (8-16). mEq/L

---

## فەحسی

# ANA

ANA Test
کورتکراوەی ANA ئاماژەیە بۆ (Antinuclear Antibody) هەرکاتێک لە فەحسی خوێندا ANAبوونی هەبوو ئەوا زۆرجار دەرخەری ئەوەیە کە حاڵەتی autoimmune Disorder بوونی هەیە ، ئەم حاڵەتەش بریتییە لە پەلاماردان و هێرشی سیستمی بەرگری لەش بۆسەر خانە و ئەندامەکانی خۆی بە هەڵە ، ئەم حاڵەتە هۆکارە بۆ دروستبونی چەندین کێشە و حاڵەتی دیکەی مەترسیدار.

بۆ مەبەستی ڕوونکردنەوەی زیاتر دژەتەن (antibody) پرۆتینێکە سیستمی بەرگری لەش دروستی دەکات بۆ پەلاماردان و هێرشکردنە سەر هەر میکرۆب و تەنێکی نامۆ کە دێتە لەشەوە وەک ڤایرۆس و بەکتریا ، بەڵام (Antinuclear Antibody) هێرش دەکاتە سەر خانەکانی سیستمی بەرگری خۆی لەجیاتی میکرۆبەکە بۆیە ناودەبرێت بە دژە خانە چونکە سەنتەری خانەی سیستمی بەرگری لەش دەکاتە ئامانج ، کە دەڵێین Nuclear ئەوا مەبەستمان لێی سەنتەر یان ناوەندی خانەکەیە.

فەحسی ANA بۆچی بەکاردێت؟
ئەم فەحسە یارمەتی دەستنیشانکردنی تێکچون و هێرشی سیستمی بەرگری لەش بۆسەر خانەکانی خۆی دەدات ، وەک حاڵەتەکانی...

- نەخۆشی گورگە یان , Lupus کە باوترینیان ناودەبرێت بە (SLE) ، نەخۆشییەکی درێژخایەنە کە کاریگەری دەخاتە سەر چەندەها ئەندام و پێکهاتەی لەش وەک ، ، جومگە و لوولە خوێنەکان و گورچیلەکان و مێشک.
- هەوکردنی جومگەی ڕوماتیزمی ، حاڵەتێکە دەبێتە هۆی ئازار و ئاوسان لە جومگەکاندا بە تایبەت لە دەست و پێیەکاندا.
-حاڵەتی , Scleroderma نەخۆشییەکی دەگمەنە کاریگەری دروستدەکات لەسەر پێست و جومگە و لوولەخوێنەکان.
بۆیە لەکاتی دەرکەوتنی نیشانەکانی هەریەکێک لەو حاڵەتانە و نیشانەکانی تێکچونی سیستمی بەرگری لەش بەهۆکاری هێرشی خۆیەکی ئەم فەحسە ئەنجامدەدرێت ، نیشانەکانیش بریتین لەمانە:-
- تـــا.
- شەکەتی و ماندویی.
- ئازار و ئاوسانی جومگەکان.
- ئازاری ماسولکەکان.

*ئاساییانە ئەنجامدانی ئەم فەحسە لە ڕێگەی وەرگرتنی نمونەیەک لە خوێن دەبێت.
لە دەرئەنجامی ئەم فەحسەدا ئەگەر ئەنجامەکەی Positive بوو ئەوا دەرخەری ئەوەیە (ANA) بوونی هەیە لە خوێندا ، وە لەم کاتەدا گومانی بونی حاڵەتەکانی سیستمی بەرگری لەش کە لەسەرەوە باسمان کرد یان بونی ڤایرۆس.

لەگەڵ ئەوەشدا مەرج نییە ئەنجامی Positive لەم فەحسەدا هەموو کات دەرخەری نەخۆشی بێت چونکە هەندێک کەسی تەندروست ئاساییانە (ANA) بوونی هەیە لە خوێنیاندا ، یان بە کاریگەری هەندێ دەرمان ئەنجامەکەی Positive دەردەچێت.

تێبینی/ بوونی (ANA)لە خوێندا هەندێ جار ڕودەدات بە زیادبونی تەمەن ، بە نزیکەی یەک لەسەر سێی ئەو کەسانەی تەمەنیان لە ٦٥ ساڵ زیاترە دەرئەنجامی ئەم فەحسە تێیاندا Positive دەردەچێت.

---

# فەحسی کۆرتیزۆل
# Cortisol Test

کۆرتیزول هۆرمۆنێکە کە بەنزیکەیی کاردەکاتە سەر هەموو شانە و ئەندامەکانی لەش، ڕۆڵێکی گرنگی هەیە لەم خاڵانەی خوارەوەدا :-

- وەڵامدانەوە بۆ سترێس.
- ڕێکخستنی شەکری خوێن.
- شەڕکردن و بەرەنگاربوونەوەی هەوکردنەکان.
- بەردەوامبوون و مانەوەی پەستانی خوێن.
- ڕێکخستنی کرداری میتابولیزمی لەش ، ئەو کردارەکە کە خۆراک شیدەبێتەوە و بەکارهێنانی ووزە.

هۆرمۆنی کۆرتیزول بەرهەمدێت لەلایەن ڕژێنی ئەدرینالین ، ئەم ڕژێنە شوێنەکەی لە لووتکەی گوورچیلەکاندایە ، فەحسی کۆرتیزول پێوانی ڕێژەی کۆرتیزوڵە لە خوێن و میز یان لیک ، ئاساییانە باوترین ڕێگەی پێوانی ڕێژەی کۆرتیزول لە ڕێگەی خوێنەوە ئەنجامدەدرێت ، بەرزی ڕێژەی کۆرتیزوڵ یان نزمی لە ڕێژەکەی دەرخەری نەخۆشی و کێشەو گرفتە لە ڕژێنی ئەدرینالین ، بۆیە ئەگەر چارەسەر نەکرێت مەترسیداردەبێت، بۆنموونە حاڵەتی Cushing's Syndrome لەم حاڵەتەدا لەش بڕێکی زۆر لە هۆرمۆنی کۆرتیزول درووستدەکات.

بەڵام حاڵەتێکی دیکە هەیە ناودەبرێت بە Addison Disease لەم حاڵەتەیاندا لەش بڕی تەواو و پێویست دروەست ناکات لە کۆرتیزول. بۆیە وا پێویست دەکات لەکاتی دەرکەوتنی نیشانەی هەریەک لەو حاڵەتانەی لەسەرەوە باسمان کردن ئەم فەحسە ئەنجامبدرێت ، نیشانەکانیش بریتیین لەمانە:
*نیشانەکانی Cushing's Syndrome بریتیین لەمانە :-
- قەڵەوی ، بەتایبەت لە قەدی لەش.
- بەرزی پەستانی خوێن.
- بەرزی ڕێژەی شەکری خوێن.
- ئەرخەوانی بوونی هێڵ یان شریتەکانی سەر گەدە.
- زوو برینداربوون یان زوو ڕووشانی پێست.
- لاوازی ماسوولکەکان.
- لە ئافرەتاندا ، دەبێتە هۆی ناڕێکی سوڕی مانگانە و هەروەها زیادبوونی موو لەسەر ڕووی دەم و چاو.

---

*نیشانەکانی Addison Disease بریتیین لەمانە :-
- کەمبوونی کێشی لەش.
- شەکەتی و ماندوویی.
- لاوازبوونی ماسوولکەکان.
- ئازاری سک.
- دابەزینی پەستانی خوێن.
- هێڵنج و ڕشانەوە.
- سکچوون.
- کەمبوونی مووی لەش.

*هەروەها فەحسی کۆرتیزول پێویستە بکرێت کاتێک نیشانەکانی Adrenal crisis دەرکەوتن ، کە حاڵەتێکی مەترسیدارە و ژیان دەخاتە مەترسییەوە کاتێک ڕێژەی کۆرتیزۆل دەگاتە ئەوپەڕی نزمی ، نیشانەکانیش بریتیین لەمانە :-
- پەستانی خوێن بە ڕاددەیەکی زۆر دادەبەزێت.
- ڕشانەوەیەکی تووند.
- سکچوونی زۆر و تووند.
- ووشکبونەوە.
- ئازارێکی تووند و کتوپڕ لە سک و بەشی خوارەوەی پشت و قاچەکان.
- سەر گێژی.
- لەدەستدانی هۆش و بێهۆش بوون.

*چۆنێتی ئەنجامدانی فەحسی کۆرتیزول :-

وەک ئاماژەمان پێدا فەحسی ڕێژەی کۆرتیزول بەزۆری لەڕێگەی خوێنەوە ئەنجامدەدرێت ئەمەش کاتێک نموونەیەک لە خوێن وەردەگیرێت بەزۆری لە خوێنهێنەری قۆڵ (باسک) ، لەبەرئەوەی ڕێژەی کۆرتیزول دەگۆڕێت بەدرێژایی ماوە جیاوازەکانی ڕۆژ بۆیە کاتی ئەنجامدانی ئەم فەحسە گرنگە ، لەبەر ئەم هۆیە فەحسی کۆرتیزۆل دووجار دەکرێت لە ڕۆژێکدا یەکەمیان بەیانیان کاتێک ڕێژەی کۆرتیزۆل ئاستی بەرزە پاشان دووبارە دەکرێتەوە لە ئێواران کاتێک ڕێژەی کۆرتیزول ئاستی نزمترە.

لەگەڵ ئەوەی کە فەحسی ڕێژەی کۆرتیزۆل لەڕێگەی خوێن باوترین ڕێگەیە بەڵام وەک لە پێشتر ئاماژەمان پێدا لەڕێگەی میز و تەنانەت لیک ئەنجامدەدرێت ، لەماوەی فەحسی میزدا کەسی پسپۆڕ داوا لەنەخۆش دەکات کە کۆی گشتی میزەکەی کۆبکاتەوە لەماوەی ٢٤ کاتژمێردا کە بەم کردارە دەڵێین (24 -hour urine sample test) ، ئەمەش هۆکارەکەی وەک لە پێشتر باسمان کرد بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە ڕێژەی کۆرتیزۆل لەماوە جیاوازەکانی ڕۆژدا دەگۆڕێت ، بۆ ئەم فەحسە کارمەندی تاقیگە یان هەرکەسێکی دیکەی پسپۆڕ ڕێنماییت دەکات بۆ چۆنێتی ئەنجامدانی ئەو کردارە کە ئاساییانە بەچەند قۆناغێکدا تێپەڕدەبێت لەوانە :-

- دەبێت میزەڵانت بەتاڵ بکەیتەوە....
- بۆ ٢٤ کاتژمێری داهاتوو کۆی گشتی میزەکە خەزن بکە.
- ئەو دەفرەی میزەکەی تێدایە دەبێت لە ساردکەرەوەدا هەڵبگیرێت یان هەر شوێنێکی سارد.
- پاشان دواتر نموونە هەڵگیراوەکە دەبەیتەوە بۆ تاقیگە.

*فەحسی ڕێژەی کۆرتیزول لەڕێگەی لیک ئەنجامدەدرێت ، بەتایبەت درەنگانی شەو کاتێک ڕێژەی کۆرتیزول لەئاستی نزمیدایە ، لەبەرئەوەی ئەم ڕێگایە بەزۆری لەماڵەوە ئەنجامدەدرێت بۆیە دکتۆر یا کەسی پسپۆڕ کەرەستەکانی ئەنجامدانی ئەم کردارە و ڕێنمایت پێدەدات بۆ ئەنجامدانی ، کەرەستەکان دەفرێک کە نمونەکەی تێدا هەڵبگیرێت لەگەڵ سوابێک بۆ کۆکردنەوەی نموونەکە ، هەنگاوەکانی ئەنجامدانی بەم شێوەیەی خوارەوە دەبێت :-

- هیچ خواردن خواردنەوەیەک مەخۆ ، هەروەها ددانەکانت مەشۆ ، لە ماوەیی ١٥ بۆ ٣٠ دەقیقە پێش ئەنجامدانی فەحسەکە.

- نموونەکە کۆبکەرەوە لەماوەی نێوان ١١ بۆ ١٢ ی شەو ، یان بەپێی ڕێنمایی کەسی پسپۆڕ.
- ئەو سوابەی پێتدراوە بیکە ناو دەمت.

- سوابەکە لەناو دەمت بسوڕێنەوە بۆماوەی ٢ دەقیقە هەتا ئەوکاتەی لیک دەبێتە کەفەرێک بەسەر سوابەکەوە.

- بەهیچ شێوەیەک دەست مەدە لە لووتکەی سوابەکە کە نموونەکەی پێوەیە.
- سوابەکە بکەرە ناو دەفرەکەی کە پێتدراوە پاشان بیبەرەوە بۆ تاقیگە.

*دەرئەنجامی فەحسی کۆرتیزۆل :-

ئەگەر ڕێژەی کۆرتیزۆل بەرزتر یان نزمتر بوو لەڕێژەی ئاسایی خۆی ئەوا زۆرجار دەرخەری کێشەو گرفتە لە ڕژێنی ئەدرینالین ، وەک لەسەرەتای ئەم فەحسەدا باسمان کرد بەرزی لە ڕێژەی کۆرتیزۆل ئاماژەیە بۆ حاڵەتی Cushing's Syndrome ، لەکاتێکدا کە نزمی ڕێژەی کۆرتیزۆل دەرخەری حاڵەتی Addison Disease یان نەخۆشییەکانی دیکەی ڕژێنی ئەدرینالین ، بەڵام لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا مەرج نییە نائاسایی بوونی ئەنجامی ئەم فەحسە هەموو کات دەرخەری نەخۆشی بێت و پێویستی بە چارەسەری پزیشکی ببێت ....

چوونکە کۆمەڵێک هۆکار و فاکتەر دەبنە هۆی گۆڕان لەڕێژەی کۆرتیزۆل لەوانە : (سترێس یان نائارامی دەروونی ، حاڵەتی دووگیانی ، حەبی مەنع و چەند دەرمانێکی دیکە ،...هتد ) بۆیە مەرج نییە هەموو کات گۆڕانی ڕێژەی کۆرتیزۆل مەترسیدار بێت و دەرخەری نەخۆشی بێت ، بەڵام لەهەموو بارەکاندا وا باشترە و پێوست دەکات سەردانی پزیشکی پسپۆڕ بکرێت بۆ دڵنیابوون لە تەندرووستیمان.

---

## فەحسی (Amylase)

## Amylase Test

لە ڕێگەی ئەم فەحسەوە پێوانەی بڕی Amylase دەکرێت لە خوێن یان لە میزدا ، Amylase بریتییە لە ئەنزیمێک یان پرۆتینێکی تایبەتە یارمەتی هەرسکردنی خۆراک دەدات، زۆربەی زۆری Amylaseدروستدەبێت لە پەنکریاس و لیکە ڕژێنەکاندا ، بەشێوەیەکی ئاسایی بڕێکی کەم لەم ئەنزیمە لە خوێن و میزدا هەیە ، بەڵام ئەگەر ڕێژەکەی زیاتر بێت یان کەمتربێت لەڕێژەی ئاسایی خۆی ئەوا دەرخەری نەخۆشیە لە پەنکریاسدا یان هەوکردن یان بەکارهێنانی زۆری ئەلکهول ، وە چەندین حاڵەتی دیکە...

ئەم فەحسە بۆچی بەکاردێت؟
لەڕێگەی فەحسی خوێنی Amylase دەتوانین پشکنین و چاودێری بوونی هەر ناتەواویەک بکەین کە لە پەنکریاسدا هەبێت بۆ نمونە هەوکردنی پەنکریاس ، هەروەها ئەم فەحسە بە ڕێگای فەحسی میزیش ئەنجامدەدرێت ، جا بەتەنها بێت یان لەدوای فەحسی خوێن ، ئەم ڕێگایەش بەهەمان شێوە بۆ دەستنیشانکردن و دیاریکردنی تێکچونەکانی پەنکریاسە ، هەروەها بۆ دیاریکردنی هەر تێکچون و ناتەواویەک کە لە لیکە ڕژێنەکاندا هەبێت.

هەریەکێک لەم دوو فەحسە دەتوانرێت وەک ڕێگایەکی چاودێری کردن بەکاربهێنرێت بۆ ڕێژەی Amylaseلە لەشی کەسێکدا کە چارەسەری نەخۆشییەکانی پەنکریاس یان هەر تێکچونێکی دیکەی پەیوەندیدار بەم ئەنزیمە بەکاربهێنێت.

زۆرجار پزیشک لەکاتی دەرکەوتنی نیشانەکانی نەخۆشی پەنکریاس ئەم فەحسە ڕەچاو دەکات ، نیشانەکانیش بریتین لەمانە :-

- هێڵنجدان و ڕشانەوە.
- ئازارێکی توندی سک.
- نەمانی ئارەزوی خواردن.
- تـــا.

هەروەها لەهەندێ حاڵەتی دیکەشدا ئەم فەحسە ڕەچاودەکرێت ، وەک حاڵەتەکانی ، هەوکردنی پەنکریاس ، دووگیانی ، نەخۆشییەکانی پەیوەندیدار بە خۆراک.

چۆن ئەم فەحسە ئەنجام دەدرێت؟

ئەم فەحسە بە دوو ڕێگە ئەنجامدەدرێت کە بریتین لە فەحسی خوێن و فەسی میز ، لەماوەی ئەنجامدانی فەحسی خوێن نمونەیەک لە خوێن وەردەگیرێت ، وە بۆ فەحسی میزیش هەندێک جار بە وەرگرتنی نمونەیەک لە فەحسی میز ئەنجام دەدرێت وە هەندێ جاری دیکە پزیشک یان کەسی پسپۆڕ داوا لە نەخۆش دەکات بە کۆکردنەوەی میزەکەی لە ماوەی ٢٤ کاتژمێردا کە بەم کردارە دەڵێن Hour urine sample test 24-، ئەنجامدانی ئەم کردارەش ئامانجەکەی ئەوەیە کە ئەنجامێکی دەقیق و ڕاستمان دەستبکەوێت ، چونکە ماددەکانی ناو میز بە گشتی کە Amylaseیەکێکە لەو ماددانە بڕەکەی بەپێی کاتە جیاوازەکانی ڕۆژ دەگۆڕێت.

دەرئەنجامی ئەم فەحسە دەرخەری چییە؟

لە ئەنجامی ئەم فەحسەدا ئەگەر ڕێژەکەی لە فەحسی خوێن یان میزدا نائاسایی بوو ئەوا دەرخەری نەخۆشی و ناتەواوییە لە پەنکریاسدا ، کاتێک ڕێژەی Amylase بەرز بێت ئەوا ئەگەری ڕوودانی هەوکردنی توند و لەناکاوی پەنکریاسە ، یان بلۆکبونی پەنکریاس ،یان شێرپەنجەی پەنکریاس.
ئەمە لەکاتێکدا نزمی لەڕێژەی Amylase دەرخەری هەوکردنی درێژخایەنی پەنکریاسە کە بەتێپەڕبونی کات تەشەنەدەکات و لەکۆتایدا ئەگەری تێکشکانی پەنکریاسی هەیە ، ئەم حاڵەتە زۆرجار بەهۆی خراپ بەکارهێنانی ئەلکهولەوە ڕوودەدات ، هەروەها نزمی ڕێژەی Amylase هەندێ جار ئاماژەیە بۆ نەخۆشی جگەر..

هەمیشە پزیشک ئاگادار بکەرەوە لە بەکارهێنانی هەر دەرمانێک کە بەکارت هێنابێت ، بەتایبەت ئەو دەرمانانەی کە تەنها لەژێر ڕێنمایی پزیشک بەکاردەهێنرێن چونکە هەندێک لەم دەرمانانە کاریگەری دروستدەکەن لەسەر ئەنجامی ئەم فەحسە.

*ئەگەر پزیشک گوومانی ئەوەی کرد کە هەوکردن و التهاباتی پەنکریاس بوونی هەیە ئەوا باشترە کە لە گەڵیدا فەحسی خوێنی Lipase ئەنجام بدرێت (Lipase Blood Test) ، چونکە Lipaseئەنزیمێکی دیکەیە کە پەنکریاس دروستی دەکات ، وە بۆ دیاریکردنی حاڵەتی هەوکردنی پەنکریاس ئەم فەحسەیان زیاتر وردتر و دەقیقترە بەتایبەت بۆ حاڵەتی هەوکردنی پەنکریاس کە هۆکارەکەی خراپ بەکارهێنانی ئەلکهول بێت.

ڕێژەی ئاسایی Amylase لەخوێندا بریتییە لە 85-23 units per liter (U/L) هەرچەندە لە هەندێ تاقیگەدا ڕێژەی ئاساییەکەی بەرزدەبێتەوە بۆ 140 U/L واتە هەتا ئەم سنورە ئاساییە .

وە لە فەحسی میزدا ڕێژەیی ئاسایی بریتییە لە 24-400.U/L
هەر بۆ زانیاری بەڕێزتان ڕێژەی ئاسایی ئەنزیمی دووەم کە لەسەرەوە ناومان برد ( Lipase) بریتییە لە 0-160. U/L

---

## فەحسی بیلیروبین لە خوێن (Bilirubin blood test)

ڕێژەی ئاسایی ئەم فەحسە:
Total bilirubin:( 0.1 - 1.2 mg/dL)

لەڕێگەی ئەم فەحسەوە پێوانەی ڕێژەی بیلیروبین دەکرێت لە خوێندا ، بیلیروبین ماددەیەکی زەردباوە کە درووستدەبێت لەئەنجامی ئەو کردارە ئاساییەی لەش کە هەڵدەستێت بە تێکشکاندنی خڕۆکە سوورەکان ، بیلیروبین لەناو شلەی زەرداو هەیە کەیارمەتیدەرە لە هەرسکردنی خۆراک ، ئەگەر جگەر تەندروست بێت و نەخۆش نەبێت ئەوا زۆربەی ئەو بیلیروبینەی کە هەیە دەیکاتە دەرەوەی لەش ، بەڵام ئەگەر جگەر بەباشی توانای ئیشکردنی نەبێت ئەوا بیلیروبینی زیادە دەچێتە ناو ڕێڕەوی خوێن و دەبێتە هۆی ڕوودانی نەخۆشی زەردوویی (Jaundice) ، زەردویی حاڵەتێکە کە وادەکات پێست و چاو بەرەو زەردباوی بڕوات.

لەڕێگەی ئەم فەحسەوە دەتوانین دەستنیشانی نوخۆشییەکانی جگەر بکەین هەروەها بۆ دیاریکردنی زەردوویی لە منداڵی تازە لەدایکبوو ، زۆربەی لە منداڵانی تازە لەدایکبوو تووشی ئەم حاڵەتە دەبن چونکە جگەریان بەتەواوی پێگەشتو و کامڵ نەبووە بۆئەوەی بەتەواوی ئەو بیلیروبینە بکاتە دەرەوەی لەش ، بەڵام خۆشبەختانە ئەم حاڵەتە لای زۆربەی منداڵان مەترسی کەمە و پاش چەند هەفتەیەک باش دەبێت ، بەڵام لە هەندێ حاڵەتی کەمدا کاتێک ڕێژەی بیلیروبین بەڕێژەیەکی زۆر زیاد دەبێت لەخوێندا ئەوا لەوانەیە زیان بە مێشک بگەیەنێت.

ئەو کاتانەی کە پێشبینی ئەنجامدانی ئەم فەحسە دەکرێت...
کاتێک نیشانەکانی زەردویی دەرکەوت ، یان تاریکبونی میز و ئازاری گەدە ، ئەمانە لەوانەیە دەرخەری هەوکردنی جگەر و نەخۆشییەکانی دیکەی جگەر بن.
بۆ پشکنینی ئەو حاڵەتانەی کە پەیوەندیان هەیە بە بوونی کێشە لە بەرهەمهێنانی خڕۆکە سوورەکان ، بەرزی لە ڕێژەی بیلیروبین لە خوێندا لەوانەیە دەرخەری نەخۆشییەکانی زراو بێت یان ئەو حاڵەتەی کە ناودەبرێت بە hemolytic anemia.

خوێندنەوەی ئەنجامی ئەم فەحسە...

ئاساییە ئەگەر ڕێژەیەکی کەمی بیلیروبین لە خوێندا هەبێت ، بەڵام بەرزی ڕێژەی بیلیروبین لەم فەحسەدا ئەوە دەردەخات کە جگەر بەشێوەیەکی باش ئیش ناکات هەروەها ئەو حاڵەتانەی کە پێشتر باسمان کرد ، بەڵام هەندێک جاریش بەرزی بیلیروبین لەوانەیە بەهۆی نەخۆشی نەبێت چونکە هەندێ دەرمان و تەنانەت خۆراکیش ڕێژەی بیلیروبین بەرزدەکەنەوە .لەگەڵ ئەمانەشدا کاتێک دکتۆر گوومانی هەبوونی نەخۆشییەکانی جگەری بوو ئەوا وا پێویستە لەگەڵ ئەنجامدانی ئەم فەحسەدا کۆمەڵێک فەحسی دیکەش ئەنجامبدات بۆ دڵنیابوونەوە وەک کۆمەڵە فەحسی هەلسەنگاندنی ئیش و فرمانی جگەر..( Liver function tests )...
تێبینی/ لە ڕێگەی فەحسی میزەوە دەتوانین فەحسی بیلیروبین بکەین ، .



# Nitrites in Urine Test

شیکاری میز (Urinalysis) کە پێشی دەوترێت Urine test واتە فەحسی میز دەتوانێت بوونی Nitritesدیارییکات لەناو میزدا ، میزی ئاسایی ماددەیەکی کیمیایی تێدایە ناودەبرێت بە نیترات (Nitrates)، ئەگەر بەکتریا بچێتە ڕێڕەوی میز ئەوا نیترات دەگۆڕێت بۆ ماددەیەکی کیمیایی جیاواز بەڵام لەناودا وەک یەکن ئەویش بریتییە لە .Nitrites هەرکات ئەم ماددەیە لە میزدا بوونی هەبوو ئەوا دەرخەری التهاباتی ڕێڕەوی میزەڕۆیە.(UTI)

هەوکردنی ڕێڕەوی میزەڕۆ یەکیکە لە باوترین جۆرەکانی هەوکردن بەتایبەت لە ئافرەتاندا ، خۆشبەختانە زۆربەی ئەم جۆرە هەوکردنانە مەترسیدار نییە و بە دەرمانی دژە هەوکردن چارەسەر دەکرێت، بۆیە وا باشترە هەرکات نیشانەکانی التهاباتی ڕێڕەوی میزەڕۆ دەرکەوتن ئەوا بەزوویی سەردانی پزیشک بکرێت بەمەبەستی زوو چارەسەرکردنی.

نیشانەکانی التهاباتی ڕێڕەوی میزەڕۆ بریتین لەمانە:-

- زیادبونی ویستی زوو زوو میزکردن بەڵام بڕێکی کەم میزدەکرێت.
- بوونی ئازار لەکاتی میزکردن.
- تاریک بون و تەڵخبون یان سورباوبونی میز.
- بۆنی خراپ و ناخۆشی میز.
- لاوازی و شەکەتی و ماندوویی بەتایبەت لە کەسانی بەتەمەندا.
- بەرزبونەوەی پلەی گەرمی لەش ( تـــا )

دەرئەنجامی ئەم فەحسە چییە؟

ئەگەر لە ئەنجامی ئەم فەحسەدا Nitrites بوونی هەبوو ئەوا ئەگەری توشبون هەیە بە التهاباتی ڕێڕەوی میزەڕۆ ، هەرچەند ئەگەر Nitrites نەبینرا لەم فەحسەدا ئەوا مەرج نییە کە التهابات بوونی نەبێت چونکە هەموو کات بەکتریا نابێتە هۆی گۆڕینی (Nitrates) بۆ Nitrites ، بۆیە لەوکاتانەی کە نیشانەی التهاباتی ڕێڕەوی میزەڕۆ دەرکەوتن و ئەم ماددە کیمیاییە دەرنەکەوت لە فەحسی میزدا ئەوا تێبینی بۆ دەرئەنجامەکانی دیکەی فەحسی میز دەکرێت ، وە بەتایبەتتر تێبینی بەرزبونەوەی ڕێژەی خڕۆکە سپیەکان دەکرێت ، چونکە لەکاتی بوونی التهابات خڕۆکە سپییەکان (WBC) ڕێژەیان بەرزدەبێتەوە.

---

## فەحسی GTT

Glucose Tolerance Test (GGT)
ئەم فەحسە چۆنێتی توانایی مژینی گلوکۆز یان شەکر لەلایەن خانەکانی لەشەوە دەردەخات لەدوای خواردنی خۆراک یان پێکهاتەیەکی شەکری، گلوکۆز لەش بەکاریدەهێنێت وەک سەرچاوەی ووزە.
پزیشک هەڵدەستێت بە وەرگرتنی ڕێژەی شەکر لە پێش خواردنی ژەمە خۆراک (Fasting Blood Sugar)، وە هیمۆگلۆبین بۆ دیاریکردن و تشخیص کردنی جۆری یەکەم و دووەمی نەخۆشی شەکرە و قۆناغی پێش نەخۆشی شەکرە.

پزیشک بەشێوەیەکی سەرەتاییانە فەحسی (GGT) بەکاردەهێنێت بۆ دیاریکردنی (Gestational Diabetes)، جگە لە جۆری یەکەم و جۆری دووەمی نەخۆشی شەکرە جۆرێکی دیکە هەیە کە لە ئافرەتاندا ڕوودەدات لەماوەی سکپڕیدا کە ناودەبرێت بە.(Gestational Diabetes)
جۆری یەکەمی نەخۆشی شەکرە Type I زۆرجار پزیشک بەزوویی دەستنیشانی دەکات چونکە بەخێرای پەرەدەسێنێت و نیشانەکانی بەزوویی دەردەکەون ، ئەمە لە کاتێکدا جۆری دووەمی Type IIلەدوای چەند ساڵێک پەرەدەسێنێت کە ئەم جۆرەیان باوترین جۆری نەخۆشی شەکرەیە و زیاتر لەدوای تەمەنی ١٨ ساڵی دەردەکەوێت.

وە ئەو جۆرەی نەخۆشی شەکرە کە لەماوەی دووگیانیدا ڕودەدات (Gestational Diabetes) پێشتر کەسەکە نەخۆشی شەکرەی لەگەڵ نەبوە بەڵام لەکاتی دووگیانیدا ڕێژەیی شەکری بەرز دەبێتەوە ، بۆ ئەم جۆرەی شەکرە زۆرجار پزیشک لەماوەی ٢٤ بۆ ٢٨ هەفتەیی قۆناغی دووگیانی ئەم فەحسە ڕەچاودەکات بۆ ئافرەتی دووگیان.

چۆنێتی ئەنجامدانی ئەم فەحسە:-

زۆرجار ئەنجامدانی ئەم فەحسە لەڕێگەی دەم (Orally) ئەنجام دەدرێت کە ناودەبرێت بە (OGTT) ، سەرەتا پێش ئەنجامدانی فەحسەکە ڕێژەی شەکر وەردەگیرێت بەوەرگرتنی نمونەیەک لە خوێن ، دوای ئەوە پزیشک داوات لێدەکات کە خواردنەوەیەک بخۆیتەوە کە بڕێکی باش گلوکۆزی تێدابێت کە زۆرجار بڕەکەی (75 گرام) بێت ، وە دوای ئەوە وەرگرتن و فەحسی خوێن دووبارە دەکرێتەوە لەدوای 30 - 60 دەقیقە لەدوای ئەو خواردنەوەی کە خواردوتە.

هەروەها لەلایەکی دیکەوە دەتوانرێت لەڕێگەی دەرزیەوە بڕێک گلوکۆز بکرێتە ناو خوێنهێنەر (Vein)، کە بەم ڕێگەیە دەڵێن (IGTt) لێرەدا (i) ئاماژەیە بۆ (injection ، بەڵام پێش ئەوەی دەرزیەکەی لێبدات ڕێژەی انسولینی خوێن وەردەگیرێت ، وە دواتر دەرزیەکەی لێدەدرێت زۆرجار لەماوەی ٣ دەقیقەدا ، وە دواتر وەرگرتنی ڕێژەی انسولین دووبارە دەکرێتەوە لەدوای نزیکەی ٢ بۆ ٣ دەقیقە دوای دەرزی لێدانەکە ، بەڵام ئەم ڕێگەیان هەرگیز بۆ تشخیص کردنی شەکرە بەکارناهێنرێت ، بەڵکو زۆرجار بۆ ئامانجی لێکۆڵینەوە بەکاردێت.

*دڵنیابە لەوەی لەماوەی چەند ڕۆژێک پێش ئەنجامدانی ئەم فەحسە خواردنی ئاسایی بخۆیت ، وە لەماوەیی ٨ کاتژمێر پێش ئەنجامدانی ئەم فەحسە هیچ خواردن و خواردنەوەیەک مەخۆ.

لەکاتی ئەنجامدانی فەحسی شەکرە کە نانت نەخواردبێت (Fasting blood sugar) ئەوا دەستنیشانی شەکرە دەکرێت ئەگەر ڕێژەکەی بەرزتربو لە 126 mg/dL یان (7 mmol/L) ، سەبارەت بە Hemoglobin A1cئەگەر ئەنجامەکەی 6.5% زیاتر بوە ئەوا شەکرە دەستنیشان دەکرێت.

هەروەها فەحسی GTT بەکاردێت کاتێک ئەنجامی فەحسی Fasting blood suger بەرز بوو بەڵام بەشێوەیەکی تەواوەتی نا واتە 125 mg/dL بوو ، ئەوا لەڕێگەی GTT پشکنینەکە ووردتر دەبێت.

*ڕێژەی ئاسایی OGTT بۆ 75 گرام لە خواردنەوەی گلوکۆز بۆ پشکنینی جۆری دووەمی شەکرە لە کەسێک کە دووگیان نەبێت :-

-Fasting : 60 - 100 mg/dL
1 Hour کەمتر بێت لە mg/dL200
2 Hour کەمتربێت لە mg/dL140

ئەم ئەنجامانە لەوانەیە بەشێوەیەکی کەم لە تاقیگەیەکەوە بۆ تاقیگەیەکی دیکە بگۆڕێت.
سەبارەت بە ئەنجامی نائاسایی ئەم فەحسە ، ئەگەر ڕێژەکەی بەرزتربوو لەو ڕێژە ئاساییانە ئەوا دەرخەری نەخۆشی شەکرە یان قۆناغی گەیشتن و نزیکبونەوەیە بە نەخۆشی شەکرە..

ئەگەر ڕێژەی Hour 2 لەنێوان 140 -200 mg/dL بوو ئەوا ناودەبرێت بە impired glucose toleranceبەشێوەیەکە کە مەترسی توشبونت زیاترە بۆ نەخۆشی شەکرە کە پزیشک بەم حاڵەتە دەڵێت. Pre-diabetes
بەڵام ئەگەر ڕێژەی گلوکۆز لە 200 mg/dL یان بەرزتربوو ئەوا دەستنیشانی نەخۆشی شەکرە دەکرێت.

*پەستانی زۆر و جەڵدەی دڵ و مێشک و نەشتەرگەری دەبنە هۆی بەرزبونەوەی ڕێژەی گلوکۆز، هەروەها هەندێ دەرمان دەبنە هۆی گۆڕانکاری لە بەرزی و نزمی ئەنجامی ئەم فەحسە بۆیە پزیشک ئاگادار بکەرەوە لە بەکارهێنانی هەر جۆرە دەرمانێک.

---

## فەحسی سورێژە و نەخۆشی ملەخڕە
## Measles and Mumps Test

نەخۆشی سورێژە و ملە خڕە هەردووکیان بەهۆکاری هەمان ڤایرۆسەوە ڕوودەدەن و دروستدەبن ، ئەم دوو نەخۆشیە هەردووکیان نەخۆشیەکی تەشەنکردو و درمە ، بەو مانایەی بەئاسانی بڵاودەبێتەوە لە کەسێکەوە بۆ کەسێکی دیکە ، سورێژە و ملە خڕە بەزۆری کاریگەری دروستدەکەن لەسەر منداڵ و زیاتر لەواندا ڕوودەدەن.

سورێژە (Measles) حاڵەتێک دروستدەکات لەکەسی توشبودا کە هەست بە توشبون بە هەڵامەت و لەرز و تا یان ئەنفلونزایەکی قورس و خراپ دەکات وە پەڵەی سوور دروستدەبێت لەسەرەتادا ئەم پەڵە سورانە لەسەر ڕوخساری دەردەکەون دواتر بڵاودەبێتەوە بە هەموو لەشیدا.
وە لە حاڵەتی ملەخڕەدا (Mumps) بەهەمان شێوە هەست بە توشبون بە ئەنفلونزا دەکرێت ، دەبێتە هۆی ئازار و هەڵئاوسانی لیکە ڕژێنەکان ئەم ڕژێنانە شوێنەکەتان لە ناوچەی ڕوومەت و شەویلگەدایە.

زۆربەی کەس کە توشی سورێژە و ملەخڕە دەبن بەرەو باش بوون دەچن لەماوەی دوو هەفتە یان کەمتر ، بەڵام لە هەندێک کەسدا دەبێتە هۆی ڕوودانی حاڵەتی مەترسیدار وەک هەوکردنی پەردەی مێشک (Meningitis) یان ە حاڵەتی (Encephalitis)ئەمەش جۆرێکی هەوکردنە لە مێشکدا. بۆیە فەحسی سورێژە و ملەخڕەوە یارمەتیدەر دەبێت بۆ دۆزینەوەی هەریەکێک لەو ڤایرۆسانە بەتایبەت لەمنداڵدا بۆئەوەی بەزویی چارەسەری بکات و ڕێگە لە بڵاوبونەوەی بگیرێت.

بۆچی پێویستە ئەم فەحسە ئەنجام بدرێت؟
کاتێک هەست بە نیشانەکانی سورێژە یان ملەخڕە کرا ئەوا پێویستە ئەم فەحسە ئەنجام بدرێت ، نیشانەکانیش بەم شێوەیەن :-

نیشانەکانی سورێژە بریتین لەمانە :-

- دروستبونی پەڵەی سور لەسەر دەم و چاو پاشان بڵاودەبێتەوە بۆ بەشەکانی دیکەی لەش وەک سنگ و قاچەکان.
- بەرزبونەوەی پلەی گەرمی لەش ( تــــا )
- کۆکە و ئاو هاتنە خواراوە بە لووتدا وەک ئەوەی هەڵامەتت بێت.
- قوڕگ ئێشە.
- خوران و سووربونەوەی چاو.
- پەڵەی بچوکی سپی لەدەمدا.

نیشانەکانی ملەخڕە بریتین لەمانە-:

-ئاوسانێکی بە ئازاری شەویلگە.
-سەرئێشە.
-ئازاری گوێ.
-ئازاری ماسولکەکان.
-تـــا.
-بونی ئازار لەکاتی قووتدان.

ڕێگاکانی ئەنجامدانی ئەم فەحسە-:
-فەحسی خوێن:- ئەم ڕێگایە بەوەرگرتنی نمونەیەک لەخوێن ئەنجامدەدرێت لە خوێنهێنەری باسک.
-بەشێوەی سڕین یان سواب:- لێرەدا پزیشک سڕەرێکی تایبەت بەکاردێنێت بۆ وەرگرتنی نمونەیەک لە لووتدا یان لە قوڕگ.
چەند ڕێگایەکی دیکەش هەیە وەک Nasal aspirate بەڵام باوترینیان ئەو دوو ڕێگەیە کە لەسەرەوە باسمان کردن.

دەرئەنجامی ئەم فەحسە دەرخەری چییە؟

ئەگەر دەرئەنجامی ئەم فەحسە Negative بوو ئەوا توشبونت نییە بە هیچ جۆرێک لە و نەخۆشی و ڤایرۆسە ، بەڵام ئەگەر ئەنجامەکەی Positive بوو ئەوا دەرخەری یەکێک لەم خاڵانەیە :-

- دەستنیشانی نەخۆشی سورێژە.
- دەستنیشانی نەخۆشی ملەخرە.
- بەکارهێنانی ڤاکسینی سورێژە و ملەخرە.
- ئەگەر پێشتر توشی یەکێک لەو حاڵەتانە بوبیتەوە .

ئەگەر فەحسەکە پۆزەتیڤ بوو وە دڵنیا بوی کە توشبای ئەو حاڵەتانەی ئەوا پێویستە ماوەی چەند ڕۆژێک لە ماڵەوە بمێنیتەوە هەتا ماوەی چاک بوون بۆئەوەی ڕێگە لە تەشەنەکردنی بگیرێت ، ئەگەر ئەنجامەکەی پۆزەتیڤ بوو بەڵام هیچ نیشانەیەکت تێدا دەرنەکەوتبوو بەڵام پێشتر توشبوبوی ئەوا باشترە ڤاکسین بەکاربهێنیت بۆئەوەی ڕێگری لە توشبون بکەیت لەداهاتودا ، ڤاکسین باشترین چارەسەرە بۆڕێگری کردن لە دژی سورێژە و ملەخرە.

سەنتەری توێژینەوەی خۆپاراستن و چارەسەری نەخۆشییەکان (CDC) ڕێنمایی دەدات کە منداڵ دووجار ئەم ڤاکسینە بەکاربهێنێت کە ناسراوە بە (MMR) ڤاکسینێکیان لە تەمەنی منداڵی ، وە ڤاکسینی دووەمیان پێش چوونە قوتابخانە.

ڤاکسینی MMR ئاماژەیە بۆ (Mealses , Mumps , Rubella) ، هەر بۆ زانیاریتان Rubella ناسراوە بە سورێژەی ئەڵمانی.

بۆ جیاکردنەوەی هەریەکێک لەو فەحسانە دکتۆر تەکنیکی تایبەت بەکاردێنێت لەڕێگەی وردبینی کردنی بۆ هەریەکێک لە دژەتەنی ئەو نەخۆشیانە.



## فحسی (HIV)

## HIV Test

- (HIV) ئاماژەیە بۆ Human immunodeficiency virus ڤایرۆسێکە هێرش دەکاتە سەر خانەکانی بەرگری لەش و دەبێتە هۆی تێکشکاندنیان ، خانەکانی سیستمی بەرگری لەش immune system cellsفرمانیان پاراستنی لەشمانە لە دژی نەخۆشی و هەر جۆرە هەوکردنێک کە هۆکارەکەی هەر جۆرە میکرۆبێک بێت وەک بەکتریا و ڤایرۆس و زیندەی نامۆ، کاتێک خانەکانی بەرگری لەش کەمبویەوە ئەوا کێشە بۆ ئەم سیستمەی بەرگری دروستدەبێت و توانای بەرەنگاربونەوەی میکرۆبی زیانبەخشی نامێنێت.

لەڕێگەی فەحسی HIV دەستنیشاندەکرێت ئەگەر لەش هەڵگری ئەم ڤایرۆسە بێت ، بەشێوەیەکی گشتی سێ جۆری سەرەکی لە فەحسی HIV هەیە کە بریتین لەمانە :-

یەکەم " antibody test فەحسی دژەتەن" لەڕێگەی ئەم فەحسەوە پشکنین دەکرێت بۆ دژەتەنی HIVلە خوێندا یان لە لیکدا ، دژەتەن (antibody)سیستمی بەرگری لەش دروستی دەکات کاتێک هەر بەکتریا و ڤایرۆسێک بچێتە لەشەوە ، لەڕێگەی ئەم جۆرە فەحسەوە دەتوانین دەستنیشانی بوونی ڤایرۆسی HIV بکەین لەلەشدا لەدوای 3 بۆ 12 هەفتە لە چونە ناوەوەی ئەم ڤایرۆسە بۆناو لەش.

واتە ئەگەر ماوەی 3 بۆ 12 هەفتە توشی ئەم ڤایرۆسە بوبیت ئینجا لەم فەحسەدا دەردەکەوێت چونکە سیستمی بەرگری لەش چەند هەفتەیەکی پێویستە بۆئەوەی دژەتەن دروست بکات بۆ ڤایرۆسی HIV

دووەم " HIV antibody / antigen test -:لەم فەحسەیاندا پشکنین دەکرێت بۆ دژەتەن و دژەپەیداکەری ڤایرۆسی HIV لەخوێندا، دژە پەیداکەر (antigen) بەشێکە لە ڤایرۆسەکە و وەڵامدانەوەی سیستمی بەرگری لەش دەوروژێنێت ، ئەگەر کەسێک هەڵگری ڤایرۆسی HIV بێت ئەوا لەم فەحسەدا دژەپەیداکەری ڤایرۆسی HIV لە خوێندا دەبینرێت لەپێش دروستبونی دژەتەن لەلایەن سیستمی بەرگری لەش. واتە لەم جۆرە فەحسەیاندا توشبونەکە زووتر دەستنیشاندەکرێت بەنزیکەی لەماوەی 2 بۆ 6 هەفتە لەدوای چونە ناوەوەی ڤایرۆسەکە بۆلەش بۆیە ئەم جۆرە فەحسەیان یەکێکە لە باوترین ڕێگاکانی ئەنجامدانی فەحسی.HIV

سێیەم " HIV viral load -:ئەم جۆرە فەحسەیان پێوانەی بڕی HIV دەکرێت لەخوێندا ، ئەم ڕێگایە بەشێوەیەکی خێراتر دەستنیشانی ڤایرۆسەکە دەکات بەبەراورد بە دوو ڕێگاکەی پێشوو ، بەڵام گرانترە.
هەموو ئەم ڕێگایانەی فەحسی HIV بۆ دەستنیشانکردن و زانینی بوونی ڤایرۆسی HIV یە لە لەشدا ، HIVهۆکارە بۆ توشبون بە نەخۆشی ئایدز Aids ، دەستەواژەی Aids ئاماژەیە بۆ ( Acquired immunodeficiency syndrome)ئایدز نەخۆشییەکی مەترسیدارە و ژیان دەخاتە مەترسیەوە و ئەگەری ڕودانی چەندین نەخۆشی و حاڵەتی مەترسیدار دەکرێت چونکە لەم کاتەدا زۆربەی خانەکانی بەرگری لەش لەدەستدراون و تێکشکاون. بۆیە ئەگەر بەزویی هەست بە بوونی HIV بکرێت ئەوا بەکارهێنانی دەرمان یارمەتیدەر دەبێت لە پاراستنی سیستمی بەرگری لەش و ڕونەدانی ئایدز.

سەنتەری خۆپاراستن و کۆنترۆلکردنی نەخۆشییەکان (CDC) ڕێنمایی دەدات کە هەرکەسێک لەماوەی تەمەنی نێوان 13 - 64 ساڵیدا ئەگەر بۆجارێکیش بێت ئەم فەحسە ئەنجامبدات بەتایبەت بۆئەو کەسانەی کە مەترسی توشبونیان زیاترە کە بەزۆری دەگوازرێتوە لەڕێگەی خوێن و پەیوەندی سێکسی، هەروەها ڤایرۆسی HIV توانایی گواستنەوەی هەیە لە دایکی دووگیان بۆ کۆرپەلەکەی هەروەها لەماوەیی قۆناغی شیرپێدان.

ئەنجامدانی ئەم فەحسە زۆرجار بە وەرگرتنی نمونەیەک لە خوێن ئەنجامدەدرێت لە خوێنهێنەری باسکی یان دەتوانرێت خوێنەکە لەسەری پەنجەی وەربگیرێت
هەروەها لەڕێگەی وەرگرتنی نمونەیەک لە لیکی کەسەکە ئەنجامدەدرێت. (Saliva)

ئەگەر لەدەرئەنجامی ئەم فەحسەدا Negative دەرچوو ئەوا واتە هەڵگری ڤایرۆسەکە نیت ، بەڵام مەرج نییە بۆ هەمووکات چونکە وەک لەسەرەتادا ووتمان دروستبونی دژەتەن و دژەپەیداکەری ئەم ڤایرۆسە لەلایەن لەشەوە ماوەی جەند هەفتەیەکی پێویستە بۆیە لەوانەیە ڤایرۆسەکە لە لەشتدا هەبێت بەڵام زووبێت بۆئەوەی لە فەحسدا دەستنیشانبکرێت ، لەم کاتەدا واباشترە فەحسەکە دووبارە بکرێتەوە پاش چەند هەفتەیەکی کەم بەتایبەت بۆئەوکەسانەی کە گومانی توشبونیان لەسەرە.

بەڵام ئەگەر لە ئەنجامی ئەم فەحسەدا Positive دەرچوو ئەوا هەڵگری ڤایرۆسەکەیە و لەم کاتەدا پەنا دەبرێتە بەر ڕێگاکانی دیکەی ئەم فەحسە بۆ دڵنیابونەوە ، ئەگەر لەوانیشدا Positive بوو ئەوا دڵنیا دەبیەوە کە هەڵگری ڤایرۆسەکەیە و پێویست بە چارەسەری پزیشکی دەکات پێش ئەوەی بچێتە قۆناغی تووشبون بە نەخۆشی ئایدز.

---

## فەحسی MCV
## Mean Corpuscular Volume (MCV)

لە خوێندا بەگشتی سێ جۆری سەرەکی لە خانەکانی تێدایە ئەوانیش بریتین لە خڕۆکە سوورەکانی خوێن ، خڕۆکە سپییەکانی خوێن ، پەڕەکانی خوێن ، لەڕێگەی فەحسی خوێنی MCV پێوانەی تێکڕای قەبارەی خڕۆکە سوورەکان دەکرێت (Red Blood Cell) ، خڕۆکە سوورەکان فرمانیان هەڵگرتن و گواستنەوەی ئۆکسجینە لە سییەکانەوە بۆ هەموو خانەکانی لەش ، خانەکانی لەشمان پێویستیان بە ئۆکسجینە بۆئەوەی گەشە بکەن و بە تەندروستی بمێننەوە ، ئەگەر قەبارەی خڕۆکە سوورەکان بچوک بن یان گەورەتربن لەڕێژەی ئاسایی خۆیان ئەوا دەرخەری نەخۆشیی و ناتەواوییە لە خوێندا بۆ نمونە کەمخوێنی یان کەمی ڤیتامین یان حاڵەتی دیکەی پزیشکی .

ئەم فەحسە بەشێکە لە فەحسی گشتی خوێ (CBC)لەم فەحسە گشتیەدا زانیاری گرنگ دەربارەی بڕی پێکهێنەرە جیاوازەکانی خوێن دەخاتە ڕوو ، بۆیە هەرکات نیشانەکانی ناتەواوی و نەخۆشی پەیوەندیدار بەخوێن دەرکەوت پەنا بۆ ئەنجامدانی فەحسی گشتی خوێن دەبرێت کە MCV یەکێکە لەو ئەنجامانەی کە لەو فەحسەوە دەستمان دەکەوێت، نیشانەکانیش بریتین لەمانە :-

- شەکەتی و ماندوبونی زۆر.
- برینداربوون یان خوێنبەربونی نائاسایی.
- ساردبونی دەست و پێیەکان.
- زەردباوبوونی پێست.

ئاساییانە ئەنجامدانی ئەم فەحسە لەڕێگەی وەرگرتنی نمونەیەک لە خوێن ئەنجامدەدرێت ، وا باشترە پێش چەند کاتژمێرێک پێش ئەنجامدانی ئەم فەحسە خواردن و خواردنەوە نەخورێت.

دەرئەنجامی ئەم فەحسە :-

ئەگەر لە ئەنجامی فەحسی MCV قەبارەی خڕۆکە سورەکان بچوکتربوون لەڕێژەی ئاسایی خۆیان ئەوا دەرخەری یەکێک لەم حاڵەتانایە :-

-کەمخوێنی ، بەتایبەت کەمخوێنی بەهۆی کەمی ماددەی ئاسنەوە ،( کەمخوێنی حاڵەتێکە تێیدا خوێن بڕێکی کەم لە خڕۆکە سورەکانی تێدایە وە کەمخوێنی بەهۆی کەمی ماددەی ئاسنی پێویست باوترین جۆری کەمخوێنییە )

- تالاسیما ، نەخۆشیەکی بۆماوەییە و تێیدا کەمخوێنییەکی تووند ڕوودەدات.
بەڵام ئەگەر لە ئەنجامی ئەم فەحسەدا قەبارەی خڕۆکە سوورەکام گەورەتربوو لەڕێژەی ئاسایی خۆی ئەوا دەرخەری یەکێک لەم حاڵەتانەیە :-

- کەمی ڤیتامین.B12
- کەمی لە ترشی فۆلیک. (Folic acid)
- نەخۆشی جگەر.
- کەم چالاکی ڕژێنی سایرۆید.

لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا مەرج نییە هەمووکات نائاسایی بوون لە ئەنجامی ئەم فەحسەدا دەرخەری ناتەواوی و کێشەی تەندروستی بێت چونکە کۆمەڵێک هۆکار دەبنە هۆی گۆڕان لە ئەنجامی ئاسایی ئەم فەحسە وەک، خۆراک ، جوڵە و چالاکی فیزیایی ، دەرمان ، سوڕی مانگانەی ئافرەتان. .هتد..
*ڕێژەی ئاسایی MCV بریتییە لە :-

80-96 fL/red cell
تێبینی / لە زانستی پزیشکیدا ئەگەر قەبارەی خڕۆکە سوورەکان بچوکتربوو لەڕێژەی ئاسایی خۆی ، واتە MCV نزم بوو ئەوا پێی دەڵێین (Microcytic)، بەڵام ئەگەر قەبارەکەی ئاسایی بوو ئەوا پێی دەڵێین (Normocytic) ، وە ئەگەر قەبارەی خڕۆکە سوورەکان گەورەتربوو لە قەبارەی ئاسایی خۆی واتە ڕێژەی MCV بەرزبوو ئەوا لە زانستی پزیشکیدا بەم حاڵەتە دەڵێین.(Macrocytic)

---

## فەحسی MPV
## MPV Blood Test

دەستەواژەی (MPV) ئاماژەیە بۆ Mean Platelet Volume ، واتە لەم فەحسەدا تێکڕای قەبارەی پەرەکانی خوێن دیاریدەکرێت ، پەرەکانی خوێن Platelet خانەی بچووکی خوێنن گرنگن بۆ کرداری مەیینی خوێن ، لەڕێگەی پرۆسەیەکەوە یارمەتی مەیینی خوێن دەدات کاتێک بریندار بوون یان خوێنبەربون ڕوبدات بە هەرهۆکارێک ، لەڕێگەی ئەم فەحسەوە پشکنین بۆ نەخۆشییە خوێن بەربونەکان و تێکچونەکانی مۆخی ئێسک دەکرێت.

بۆچی ئەنجامدانی فەحسی MPV گرنگە؟

ئەم فەحسە بەشێکە لە فەحسی گشتی خوێ (CBC)لەم فەحسە گشتیەدا زانیاری گرنگ دەربارەی بڕی پێکهێنەرە جیاوازەکانی خوێن دەخاتە ڕوو ، فەحسی MPV کاتێک پێویستە کە نیشانەکانی نەخۆشییەکانی خوێن دەرکەوتن ، نیشانەکان بریتین لەمانە:-

- بەردەوامبوونی خوێنبەربوون و خوێن لێ ڕۆشتن لەدوای برینداربیەکی کەم و بچووک.
- خوێنبەربوونی لووت.
- دروستبونی پەڵەی بچووکی سوور یان ئەرخەوانی لەسەر پێست.
- برینداربون بەبێ هۆکارێکی سەرەکی.

*ئاساییانە ئەنجامدانی ئەم فەحسەش وەک زۆربەی فەحسەکانی دیکە لە ڕێگەی وەرگرتنی نمونەیەک لە خوێن دەکرێت ، ڕێژەی ئاسایی ئەم فەحسە بریتییە لە :-
* (7.5 - 11.5 femtoliters)

دەرئەنجامی ئەم فەحسە چییە؟

ڕێژەی MPV زۆرجار لەگەڵ پێکهاتەکانی دیکەی خوێن لە ناو فەحسی CBC زانیاری گرنگمان پێدەدات ، بە ڕەچاوکردنی بڕی پەڕەکانی خوێن Platelet count زیادبوونی ڕێژەی MPV لەم فەحسەدا دەرخەری کۆمەڵێک هۆکارە لەوانە :-

-حاڵەتی Thrombocytopenia کە حاڵەتێکە تێیدا خوێن ژمارەیەکی کەمتر لە پەڕەکانی خوێنی تێدایە لەچاو ڕێژەی ئاسایی خۆیی.

-نەخۆشی Myeloproliferativeئەم حاڵەتە جۆرێکە لە شێرپەنجەی خوێن.

-حاڵەتی Preeclampsia تێکچون و ئاڵۆزیەکە لەماوەی دووگیانیدا ڕوودەدات کە دەبێتە هۆی بەرزبونەوەی پەستانی خوێن ، ئەم حاڵەتە بەزۆری ڕوودەدات لەدوای هەفتەی بیستەمین لە قۆناغی سکپڕی.

-نەخۆشییەکانی دڵ.
-نەخۆشی شەکرە.

نزمی ڕێژەی MPV لە ئەنجامی ئەم فەحسەدا لەوانەیە دەرخەری بەرکەوتن بێت بە هەندێ دەرمان کە مەترسیداربێت بۆ خانەکان ، یان درخەری حاڵەتی marrow hypoplasia بێت ئەم حاڵەتە دەبێتە هۆی کەم بەرهەمهێنانی خانەکانی خوێن.

*لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا کۆمەڵێک هۆکارو فاکتەر دەبنە هۆی گۆڕان لە ئەنجامی ئەم فەحسە بۆ نمونە بەرزی لەڕوی ئاستی ڕوی دەریاوە یان جوڵەو چالاکی فیزیایی سەخت یان هەندێ دەرمان وەک حەبی مەنع ئەمانە دەبنە هۆکارێک بۆ زیادبوونی ڕێژەی پەڕەکانی خوێن.هەروەها کەمبونی ڕێژەی پەڕەکانی خوێن کارتێدەکرێت بە قۆناغی سوڕی مانگانە یان دووگیانی ، لەهەندێ حاڵەتی دەگمەنیشدا بۆماوەییانە کاریگەری دروستدەکات.

---

## فەحسی ڤیتامینE
## Vitamin E (Tocopherol) Test

لە ڕێگەی فەحسی ڤیتامین E پێوانی بڕی ڤیتامین E دەکەین لەخوێندا ، ڤیتامین E ناوە زانستیەکەی بریتییە لە Tocopherol) یان (alpha-tocopheeol ئەم ڤیتامینە لەجۆری fat soluble واتە لەچەوریدا تواوە، گرنگە بۆ چەندین کرداری لەش وەک : یارمەتی دەمارە خانەکان و ماسولکەکان دەدات بۆئەوەی بەشێوەیەکی باش ئیشی خۆیان بکەن ، هەروەها ڕێگری دەکات لە مەیینی خوێن ، سیستمی بەرگری لەش چالاک و بەهێز دەکات ، ڤیتامین E لە جۆری دژە ئۆکسێنەکانە کە ماددەیەکە خانەکان دەپارێزێت لە تێکشکان ، ئەم ڤیتامینە پێویستی بە بایل (Bile) هەیە بۆ مژینی ، ڕێژەی ٢٥% ی لە ڕێگەی دەمەوە دەمژرێت ، ئەم ڤیتامینە لە جگەر و ماسولکە خانەکاندس خەزندەبێت.

سەرچاوە سروشتییەکان بۆ دەستکەوتنی ڤیتامین E بریتین لەمانە :-
- سەوزەوات ، چەرەسات و گوێز و بایەم ، ڕۆنی ڕووەکی ، گەنمەشامی...هتد
ئەگەر ڕێژەی ڤیتامین E لە لەشدا زۆر بێت یان کەم بێت ئەوا دەرخەری ناتەواوی و تێکچونی تەندروستیە.

فەحسی ڤیتامین E بۆچی ئەنجامدەدرێت؟

ئەم فەحسە بەکاردێت بۆ زانین و دەرخستنی ئەوەی کە ئایا بڕی تەواوی ڤیتامین E لە لەشماندایە ، یان خۆراک و سەرچاوەی پێویستی ئەم ڤیتامینە دەخۆین ، وە بۆ دیاریکردنی کەمی لەڕێژەی ئەم ڤیتامینە بەتایبەت لە منداڵی باش پێنەگەیشتوو کە لەمنداڵی بچوکدا کەمی ڤیتامین E کێشەیەکی باوە. لەکاتێکدا ئەم فەحسە ئەنجامدەدرێت کە نیشانەکانی کەمی ڤیتامین E و باش نەمژینی ئەم ڤیتامینە لە ڕێگەی خۆراکەوە دەرکەوتن ..

یان لەکاتی دەرکەوتنی نیشانەکانی زۆری لەڕێژەی ئەم ڤیتامینە لە لەشماندا ، نیشانەکانیش بەم شێوەیەن :-

*نیشانەکانی کەمی ڤیتامین E بریتین لەمانە :-

- لاوازی ماسولکە خانەکان کاردانەوەی هێواش.
- قورسی لەڕۆشتندا یان لارەلار و کەم توانایی لە ڕۆشتندا.
- درووستبونی کێشە لە چاو و بینیندا.

تێبینی/ کەمی ڤیتامین E لەوانەیە لە کەسێکی تەندروستدا کە هیچ نەخۆشییەی نەبێت زۆر باو نەبێت بەڵکو لەکاتێکدا ڕوودەدات کە کێشەی تەندروستی دروست ببێت لە باش هەرس نەکردن یان کەم توانایی بۆ کرداری هەرسکردن و مژینی خۆراکە ماددەی پێویست ، هەندێک لەو حاڵەت و تێکچونانە بریتین لە حاڵەتی Systic fibrosis کە نەخۆشییەکی زگماگی منداڵانە و بریتیە لەزۆربونی ڕیشاڵە مادده ، نەخۆشی جگەر ، یان Chron's disease و نە خۆشییە بۆماوەییەکانی دیکە، هەروەها کەمی ڤیتامین E لەوانەیە بەهۆکاری کەمی سەرچاوەی خۆراکی چەوری بێت کە بەڕاددەیەکی زۆر دوورکەوتبێتەوە لەو جۆرە خۆراکانە بەبیانووی پارێزی.

*نیشانەکانی بەرزی ڕێژەی ڤیتامین E بریتین لەمانە :-
-سکچوون.
-ڕشانەوە.
-شەکەتی و ماندووی زۆر.

زۆری ڕێژەی ڤیتامین E زۆرجار لەئەنجامی زۆر وەرگرتنی سەرچاوەی ڤیتامین E یان دەرمانی سەپلیمێنت ڕوودەدات ، وە ئەگەر بەزووی چارەسەری ئەم حاڵەتەی بەرزی ئەم ڤیتامینە نەکرێت حاڵەتی مەترسیداری لێدەکەوێتەوە و لەوانەیە ببێتە هۆی ڕوودانی جەڵدەی مێشک.(Stroke) ئاساییانە وەک زۆربەی فەحسەکانی دیکە ئەنجامدانی ئەم فەحسەش لەڕێگەی وەرگرتنی نمونەیەک لەخوێن دەبێت ، وە پێویستە وە باشترە بۆماوەیی ١٢ بۆ ١٤ کاتژمێر پێش ئەنجامدانی فەحسەکە خواردن و خواردنەوە نەخۆیت.

ڕێژەی ئاسایی ڤیتامین E چەندە؟
ڕێژەی ئاسایی بۆ کەسێکی پێگەیشتوو (adult) بریتییە لە 5.5 - micro gram /mL.17
لە منداڵدا :- 3 - micro gram /mL.18.4

دەرئەنجامی ئەم فەحسە چییە؟
ئەگەر لە ئەنجامی فەحسەکەدا ڕێژەی ڤیتامین E کەم بوو ئەوا نیشانەی کەمی مژینی ئەم ڤیتامینەیە لە سەرچاوەکانیەوە ، وە کەمی ئەم ڤیتامینەش لەڕێگەی وەرگرتن و بەکارهێنانی دەرمانی سەپلیمێنتی ڤیتامین E چارەسەر دەکرێت.

بەڵام کاتێک لە ئەنجامی ئەم فەحسەدا ڕێژەکەی بەرزتربوو لەڕێژەی ئاسایی خۆی ئەوا نیشانەی زیاد مژین و وەرگرتنی ڤیتامین E یە ، یان لەکاتی زیاد بەکارهێنانی دەرمانی ڤیتامین.E
تێبینی/ هەندێ کەس باوەڕیان وایە دەرمانی سەپلیمینتی ڤیتامین E یارمەتیدەرە لە قەدەغەکردنی هەندێک نەخۆشی ، بەڵام هیچ بەڵگەیەکی جێگیر نییە کە بیسەلمێنێت دەرمانی ڤیتامین E دەمانپارێزێت لە نەخۆشییەکانی دڵ ، شێرپەنجە ، نەخۆشییەکانی چاو.

---

## فەحسی سایرۆکسین

## Thyroxine Test

لەڕێگەی فەحسی سایرۆکسین پشکنین دەکرێت بۆ هەر جۆرە نەخۆشی و تێکچونێک کە لە لیکە ڕژێنی دەرەقیدا هەیە یان غوددە (Thyroid) ، ڕژێنی غوددە ڕژێنێکی شێوە پەپولەییە شوێنەکەی لە نزیکی گەروودایە ئەم ڕژێنە چەند هۆرمۆنێکی گرنگ بەرهەمدەهێنێت کە فرمانی گرنگیان هەیە لە لەشدا وەک ، ڕێکخستنی ئەو ووزەیەی کە لەش پێویستیەتی و بەکاریدەهێنێت ، هەروەها ڕۆڵێکی گرنگیان هەیە لە کۆنترۆڵکردن و ڕێکخستنی کێشی لەش و پلەی گەرمی لەش ، هەروەها بەهێزی و قوەتی ماسولکەکان و چۆنێتی شێوازی هەڵسوکەوت و مەزاج .

هۆرمۆنی Thyroxine کە ناسراوە بە (T4) یەکێکە لەو هۆرمۆنانەی کە ڕژێنی غوودە (Thyroid)دەریدەدات ، لەڕێگەی فەحسی (T4) پێوانەی ڕێژەی ئەم هۆرمۆنە دەکرێت لە خوێندا ، بەرزی یان نزمی لە ئەنجامی ڕێژەی ئەم فەحسە دەرخەری نەخۆشی و تێکچونە لەڕژێنی غوددە.
هۆرمۆنی (T4) بە دوو شێواز دەگاتە جێ :-

یەکەمیان بەشێوەی فرییە (Free T4) ئەم شێوازەیان دەچێتە ناو شانەکانی لەش هەرکات پێویست بوو دووەمیان سنور بۆ دانراوە (Bound T4) ئەم شێوازەیان دەچێتە پاڵ پرۆتین و قەدەغەی دەکات بچێتە ناو شانەکانی لەش.
لەڕێگەی ئەم فەحسەوە پێوانەی ڕێژەی هەردوو جۆرەکە دەکرێت کە ناسراوە بە سایرۆکسینی گشتی (Total thyroxine)، بەڵام فەحسی دیکە هەیە کە تەنها پێوانی سایرۆکسینی فری دەکات (Free T4)کە ئەمەیان زیاتر دەقیقتر و ووردترە.

بۆچی پێوستە ئەم فەحسە ئەنجام بدرێت؟
نەخۆشییەکانی ڕژێنی غوددە زیاتر باوترە لە ئافرەتاندا بەتایبەت لە خوار تەمەنی ٤٠ ساڵی ، کاتێک لە خێزانەکەتدا حاڵەتی تووشبو هوبوو یان نیشانەکانی بەرزی هۆرمۆنەکانی سایرۆید کە ناودەبرێت بە (Hyperthyroidism) تێیدا دەرکەوت یان نیشانەکانی نزمی هۆرمۆمۆنەکانی سایرۆید کە ناسراوە بە (Hypothyroidism)تێیدا دەرکەوت ئەوا پێویستە ئەم فەحسە ئەنجامبدرێت ، نیشانەکانیش بریتین لەمانە :-

*نیشانەکانی بەرزی هۆرمۆنی سایرۆید (Hyperthyroidism) کە ناسراوە بە زیاد چالاکی ڕژێنی سایرۆید بریتین لەم نیشانانە :-

- کەمبوونی کێش.
- قەلەقی.
- لەرزینی دەستەکان.
- خێرا لێدانی دڵ.
- دروستبونی کێشە لە خەوتندا.

*نیشانەکانی نزمی ڕێژەی هۆرمۆنی سایرۆید (Hypothyroidism) بریتین لەمانە :-
- زیادبوونی کێش.
- وەرینی قژ.
- شەکەتی و ماندوویی.
- کەم بەرگەگرتن بەرامبەر کەشی سارد.
- نارێکی سوڕی مانگانە.
- قەبزی.

*ڕێژەی ئاسایی هۆرمۆنی سایرۆکسین بریتییە لە :-

(60 - 120) nmol/L

تێبینی/

١- لەماوەی دووگیانیدا ڕێژەی هۆرمۆنەکانی سایرۆید لەوانەیە کەمێک بگۆڕێت ، حاڵەتی (Hyperthyroidism)ڕوودەدات بەنزیکەیی لە هەر یەکێک لە ئافرەتی دوگیان لەکۆی گشتی ٥٠٠ ئافرەتی دووگیان ، وە حاڵەتی نزمی سایرۆید (Hypothyroidism) ڕوودەدات بەنزیکەیی لە یەکێک لە ئافرەتي دووگیان لە کۆی گشتی ٢٥٠ ئافرەتی دووگیان ، وە هەندێ جار ئەم حاڵەتە لەدوای لەدایکبوونی منداڵەکەش دەمێنێتەوە لە دایکەکە بۆیە هەمیشە پێویستە چاودێری پزیشک و فەحس پشت گوێ نەخرێت.

٢- سایرۆید هۆرمۆنێکە لەلایەن ژێر مێشکە ڕژێنەوە هان دەدرێت ..هۆرمۆنەکانی سایرۆید ڕۆڵێکی گرنگیان هەیە لە ڕێکخستنی ئەو ووزەیەی کە لەش بەکاری دێنێت..

ڕێژەی ئاسایی micro Iu/ml(TSH)0.25-5
ئەگەر لە فەحسدا ڕێژەی سایرۆی (TSH) بەرز بێت ، ئەوا ئاماژەیە بۆ کەم چالاکی سایرۆیدە ڕژێن Hypothyroidism، وە ئەگەر زۆر بەرزیش بێت ئەوا لەوانەیە نەخۆشەکە کێشەی لە ژێر مێشکە ڕژێندا هەبێت.(pituitary gland)

---

## فەحسی گلوبولین Globulin Test

گلۆبولین گرووپێکی پرۆتینە لە ناو خوێندا ، درووست دەبێت لە جگەردا لەلایەن سیستمی بەرگری لەش (immune system) ، گلوبولین فرمان و ڕۆڵێکی گرنگی هەیە لە فرمانی ئاسایی جگەر ، مەیینی خوێن ، شەڕکردن دژی هەوکردن و هەر زیندەیەکی نامۆ کەبێتە لەشەوە
.
چوار جۆری سەرەکی لە گلوبولین هەیە کە بریتین لەمانە :-

-ئەلفا ١ (alpha1)
-ئەلفا ٢ (alpha2)
-بێتا(Beta)
-گاما(Gamma)

وەک ئەوەی کە جۆری جیاواز لە گلوبولین هەیە ، بەهەمان شێوە جۆری جیاواز لە فەحسی گلوبولین هەیە ، لەوانە :-

* Total protein test

ئەم فەحسە لەڕێگەی خوین دەکرێت تێیدا پێوانەی ڕێژەی دوو جۆری جیاواز پرۆتین دەکرێت ئەوانیش (گلوبولین و ئەلبۆمین) ئەگەر لە ئەنجامەکەیدا رێژەی پرۆتینەکان نزم بوو ئەوا گومانی بوونی نەخۆشی جگەر یان نەخۆشی گوورچیلەکان دەکرێت.

* Serum protein electrophoresis

ئەم فەحسەش لەڕێگەی خوێن ئەنجامەدرێت ،بەتایبەتی پێوانی ڕێژەی گاما گلوبولین دەکات هەروەها پرۆتینەکانی دیکەی ناو خوێن ، ئەم فەحسە بۆ پشکنینی تێکچونەکانی سیستمی بەرگری لەش ئەنجامەدرێت هەروەها بۆ جۆرێکی دیاریکراو لە شێرپەنجە کە ناودەبرێت بە Multiple Myeloma.

بەشێوەیەکی گشتی فەحسی گلوبولین بۆ ئەم مەبەستانەی خوارەوە ئەنجامەدرێت :-

- نەخۆشییەکانی جگەر.
- نەخۆشی گوورچیلەکان.
- کێشەکانی خۆراک.
- تێکچوونەکانی سیستمی بەرگری لەش.
- جۆری تایبەت لە شێرپەنجە.

ئەو کاتانەی کە پێویستدەکات ئەم فەحسە ئەنجامبدرێت :-

کاتێک دکتۆری پسپۆر ئەم فەحسە بەکاردێنێت کە گومانی لەو حاڵەت و نەخۆشیانە هەبێت کە لەسەرەوە باسمان کرد بەتایبەت Total protein test بۆ زانین و پشکنینی هەر تێکچونێک کە لە جگەردا هەبێت ، نیشانەکانی نەخۆشی و تێکچونی جگەر بریتین لەمانە :-

- زەردوویی ، حاڵەتێکە تێیدا پێست و چاو بەرەو زەردباوی دەڕوات.
- هێڵنجدان و ڕشانەوە.
- خوران.
- شەکەتی و ماندوویی.
- کۆبونەوەی فلود و شلە لە سک و قاچ و پێیەکان.
- کەمبونی ئارەزووی خواردن.

*فەحسی گلوبولین بە وەرگرتنی نمونەیەک لە خوێن ئەنجامدەدرێت وا باشترە چەند کاتژمێرێک پێش ئەنجامدانی ئەم فەحسە هیچ خواردن و خوردنەوەیەک نەخورێت.

دەرئەنجامی ئەم فەحسە :-
ئەگەر لە ئەنجامی ئەم فەحسەدا ڕێژەی گلوبولین نزم بوو ئەوا نیشانەی بوونی نەخۆشی و ناتەواوییە لە جگەر یان گوورچیلەکان ، بەڵام ئەگەر لە ئەنجامی ئەم فەحسەدا ڕێژەی گلوبولین بەرز بوو ئەوا نیشانەی بوونی هەوکردن یان تێکچوونەکانی سیسیمی بەرگری لەش هەروەها لە جۆری دیاریکراوی شێرپەنجە کە ناودەبرێت بە multiple myeloma ڕێژەی گلوبولین بەرز دەبێتەوە.

لەگەڵ هەموو ئەوانەشدا لەوانەیە ئەنجامی ئەم فەحسە نائاسایی بێت بەبێ هەبوونی هیچ یەکێک لەو حاڵەتانەی کە کەسەرەوە باسمان کرد بەڵکو بەهۆی بەکارهێنانی هەندێ جۆری دەرمان یان ووشکبونەوە و هەندێ هۆکار و فاکتەری دیکە ،،، بۆیە لە کاتی بوونی هەر هۆکارێک لەو هۆکارانە پزیشک ئاگادار بکەرەوە..

---

# Prealbumin Blood test

لەڕێگەی ئەم فەحسەوە ڕێژەی Prealbumin لەخوێندا دیاریدەکرێت ، Prealbuminپرۆتینێکە لەلایەن جگەرەوە دروستدەکرێت ، ئەم پرۆتینە فرمان و ڕۆڵێکی گرنگی هەیە لە هەڵگرتنی هۆرمۆنی سایرۆید و ڤیتامین A لەخوێندا ، هەروەها گرنگە بۆ ڕێکخستنی چۆنێتی بەکارهێنانی ووزەی لەش.

ئەگەر لە فەحسدا ڕێژەی ئەم پرۆتینە کەمتربوو لەڕێژەی ئاسایی خۆی لەوانەیە هۆکارەکەی خراپخۆری بێت واتە نەخواردنی خۆراکی پێویست نەگەیشتنی کالۆری گرنگ وەک ڤیتامین و کانزاکان کە گرنگن بۆ تەندروستی لەش.

ئەم فەحسە بۆچی بەکاردێت؟
لەڕێگەی ئەم فەحسەوە پشکنین دەکرێت بۆ زانینی گەیشتنی بڕی پێویست لە خۆراکە ماددە بۆ لەش بەتایبەتی پرۆتین، هەروەها بۆ پشکنین و تشخیص کردنی چەند نەخۆشییەک بەکاردێت.
بۆیە لەکاتی دەرکەوتنی نیشانەکانی خراپخۆری ئەم فەحسە پێویستدەکات ئەنجامبدرێت ..

نیشانەکانیش بریتین لەمانە:-
-کەمبوونی کێش.
-لاوازی.
-زەردباو بوون و ووشکبونی پێست.
-زوو شکانی قژ.
-ئازاری ئێسک و جومگەکان.
- لە منداڵدا ئەگەر خۆراکی پێویستی نەخوارد واتە حاڵەتی خراپ خۆر بوو ئەوا گەشەی وەک پێویست نییە.

*ئاسایی ئەنجامدانی ئەم فەحسەش وەک زۆرینەی فەحسەکانی دیکە لەڕێگەی وەرگرتنی نمونەیەک لە خوێن ئەنجامدەدرێت.

*ڕێژەی ئاسایی ئەم پرۆتینە بۆکەسێکی پێگەشتوو بریتییە لە 15 - 36. mg/dL
دەرئەنجانی ئەم فەحسە دەرخەری چییە ؟

ئەگەر لە دەرئەنجامی ئەم فەحسەدا ڕێژەی پرۆتینی Prealbumin کەمتر بوو لە ڕێژەی ئاسایی خۆی ئەوا هۆکاری سەرەکی بریتییە لە نەخواردنی خۆراک و کالۆری پێویست ، هەروەها چەند حاڵەتێکی دیکەش دەبنە هۆی کەمی لە ڕێژەی ئەم پرۆتینە وەک :-

- نەخۆشی جگەر ، ڕوودانی هەر حادسەیەک بۆ نمونە سووتاوی، هەوکردن ، نەخۆشی درێژخایەن.

بەرزی لەڕێژەی ئەم پرۆتینە لەوانەیە دەرخەری نەخۆشی گورچیلەکان بێت یان حاڵەتی دیکە بەڵام لەم کاتەدا بەزۆری پشت دەبەسترێت بە فەحسی دیکە بۆدیاریکردنی هۆکارەکەی.
لەگەڵ هەموو ئەوانەشدا نائاسایی بوون لە ئەنجامی ئەم فەحسە مەرج نییە هەموو کات دەرخەری ناتەواوی و کێشەی تەندروستی بێت چونکە هەندێ هۆکار و فاکتەر دەبنە هۆی گۆڕانکاری لە ئەنجامی ئەم فەحسە بۆ نمونە لەکاتی دووگیانی یان بەکارهێنانی هەندێ دەرمان وەک ستیرۆیدەکان یان بەکارهێنانی ئەلکهول، بۆیە لەم کاتانەدا دکتۆر ئاگادار بکەرەوە لە بەکارهێنانی هەر جۆرە دەرمانێک.

---

## فەحسی پڕۆتین لە میزداProtein in Urine Test ::

پڕۆتین ماددەیەکی گرنگە بۆ بڕێوەچوونی فرمانەکانی لەش بەڕێک و پێکی لەڕێگەی ئەم فەحسەوە ڕێژەی پڕۆتین لەناو میزدا دیاریدەکرێت ، بوونی بڕێکی کەم پڕۆتین لە میزدا ئاساییە ، بەڵام ئەگەر ڕێژەکەی زۆر بوو ئەوا ئاسایی نییە و دەرخەری ناتەواوی کێشەیە لە گوورچیلەکاندا ، چونکە کاتێک گورچیلەکان تووشی کێشە دەبنەوە ئەوا پڕۆتین لە خوێنەوە دەچێتە ناو میز بەمەش ڕێژەی پڕۆتین تێیدا بەرز دەبێتەوە.

ئەم فەحسە بۆچی بەکاردێت ؟
ئەم فەحسە بەشێکە لە فەحسەکانی شیکردنەوە و زەرعی میز Urinalysis کە تێیدا پێوانەی ڕێژەی خانە جیاوازەکان و ماددە کیمیاییەکان و پڕۆتین دەکرێت لەناو میزدا ، ئەم شیکارییە بەشێوەیەکی گشتی بۆ چاودێریکردنی نەخۆشییەکانی گورچیلە بەکاردێت.

بۆیە دکتۆر جەخت دەکاتەوە لەسەر ئەنجامدانی ئەم فەحسە لەپاڵ فەحسەکانی دیکەدا کاتێک نیشانەکانی نەخۆسی گورچیلە دەرکەوتن ، نیشانە سەرەکییەکانی نەخۆشی گورچیلە بریتین لەمانە :-

- ناڕەحەت قورس میزکردن.
- زۆر دووبارەبونەوەی میزکردن بەتایبەت لە شەواندا.
- هێڵنجدان و ڕشانەوە.
- ئاوسانی دەست و پێیەکان.
- نەمانی ئارەزووی خواردن.
- شەکەتی و ماندوویی.
- خوران.

هەندێ جار بۆ ئەنجامدانی ئەم فەحسە لەوانەیە دکتۆر داوات لێبکات بۆ کۆکردنەوە ئەو میزەی کە لەماوەی ٢٤ کاتژمێردا دەیکەیت کە ئەم سێوازە ناسراوە بە 24 Hour Urine sample test-، ئەمەش هۆکارەکەی ئەوەیە کە بڕی ماددەکانی ناو میز وەک پڕۆتین ڕێژەکەی دەگۆڕێت بەپێی کاتە جیاوازەکانی ڕۆژ بەم ڕێگەیە یارمەتیدەر دەبێت لە گەیشتن بە ئەنجامێکی درووست.

ئەنجامی ئەم فەحسە دەرخەری چییە ؟
ئەگەر لە دەرئەنجامی ئەم فەحسەدا ڕێژەی پڕۆتین بەرز بوو ئەوا مەرج نییە دەرخەری کێشە و گرفتی تەندروستی بێت چونکە کۆمەڵێک هۆکار هەیە کە دەبنە هۆی بەرزبونەوەی ڕێژەی پڕۆتینی ناو میز ، هەندێ لەو هۆکارانە بریتین لە : سترێس ، وەرزشکردنێکی توند ، لەماوەیی دووگیانی ، خواردن ...

ئەمانە و چەندین فاکتەری دیکە هۆکارن بۆ بەربونەوەی پرۆتینی ناو میز بەشێوەیەکی کاتی، بۆیە زۆرجار لەکاتی ئەنجامدانی ئەم فەحسە ئەگەر ڕێژەکەی نائاسایی بوو ئەوا دکتور تەنها پشت بەم فەحسە نابەستێت بۆ بڕیاردان لەوەی کە ئەم کەسە کێشەیەکی هەیە لە گورچیلەکانی بەڵکو لەپاڵ ئەمەدا کۆمەڵێک پشکنینی دیکە ئەنجامدەدات ، لەگەڵ ئەوانەشدا ئەگەر ڕێژەی پرۆتینی ناو میز بەرز بوو ئەوا گوومانی چەند کێشە و گرفتێک دەکرێت لە لەشدا کە سەرەکیترینیان نەخۆشی گوورچیلەیە ، حاڵەتەکانی دیکەش بریتین لەمانە :-

- هەوکردنی ڕێڕەوی میزەڕۆ.
- بەرزی پەستانی خوێن.
- گورگە ' نەخۆشییەکی پێستە.
- حاڵەتی Preeclampsia کە زنجیرەیەک گرفتە لە ئافرەتی دووگیاندا ڕوودەدات، بەرزی پەستانی خوێن تێیاندا ڕوودەدات ئەم زنجیرە حاڵەتە ئەگەر چارەسەر نەکرێت مەترسی درووستدەکات بۆسەر دایکەکە و کۆرپەلەکەش.
- نەخۆشی شەکرە.
- هەندێ جۆری شێرپەنجە.

---

# Yeast infection Test

ترشێنە یان (Yeast) جۆرێکی کەڕووە دەژی لەسەر پێست و دەم و ڕێڕەوی هەرس و ئەندامی زاوزێ.بوونی هەندێک لەم کەڕووە لەسەر لەش ئاساییە بەڵام کاتێک گەشەی زۆربوو ئەوا دەبێتە هۆی هەوکردن لەسەر پێست و شوێنەکانی دیکەی لەش کە لەسەری دەژی.

بۆچی پێویستە ئەم فەحسە ئەنجامبدەین ؟
لەڕێگەی فەحسی (Yeast infection test) هەر هەوکردنێک هەبێت بەهۆی ئەم کەڕووەوە دەردەکەوێت ، ئەم فەحسە بە جۆری جیاواز ئەنجامدەدرێت کە پشت دەبەستێت بەو شوێنەی کە نیشانەکانی تێدا دەرکەوتووە ، کاتێک نیشانەکانی هەوکردن بەهۆی ئەم کەڕووەوە دەرکەوت ئەوا پشت بەم فەحسە دەبەسترێت نیشانەکانیش دەگۆڕێت بەپێی شوێنە جیاوازەکانی لەش کە حاڵەتەکەی تێدا ڕویداوە ، کە بەزۆری لە ناوچەی شێداردا ڕوودەدات لەسر پێست یان پەردەی لینجە ماددەکان، لێرەدا باسی چەند نیشانەیەک دەکەین بەپێی ڕودانی حاڵەتەکە لەشوێنە جیاوازەکانی لەشدا...

نیشانەکان لەکاتی ڕوودانی هەوکردن لەسەر پێست :-
نیشانەکان بەگشتی وەک حاڵەتی پێی وەرزشەوان وایە کە بریتین لەمانە..
- پەڵەی سووری بریقەدار لەسەر پێست ، زۆرجار برینداری یان سوەربونەوەی پێست ڕوودەدات.
- هەستکردم بە سووتانەوە.
- خوران و وەرەس کردن.

نیشانەکانی هەوکردن بەهۆی ئەم کەڕووەوە لە ئەندامی زاوزێی مێینە :- حاڵەتێکی باوەو بەنزیکەی لە 75% ئافرەتان بەلایەنی کەمەوە بۆ جارێکیش بێت توشی ئەم حاڵەتە دەبن ، نیشانەکان بریتین لەمانە :

- خواران یان سووتانەوە لە ئەندامی زاوزێ.
- بوونی ئازار لەکاتی میزکردن.
- سوربونەوە و گۆڕانی ڕەنگی ئەندامی زاوزێ.

*نیشانەکانی هەوکردن بەهۆی ئەم کەڕووەوە لە دەمدا :-
ئەم جۆرەیان زیاتر لە منداڵدا باوە ، بەڵام ئەگەر لەکەسێکی پێگەشتودا ڕویدا ئەوا بەزۆری دەرخەری لاوازی سیستمی بەرگری لەشە ، نیشانەکان بەم شێوەیە دەردەکەون:-
- پەڵەی سپی لەسەر زمان و دیوی ناوەوەی ڕوومەت.

*نیشانەکان لە هەوکردن بەهۆی ئەم کەڕوە لە نینۆکەکاندا :-
ئەگەرچی ئەگەری ڕوودانی هەیە لە نینۆکی دەست و پێیەکانیشدا بەڵام لە نینۆکی پێیەکاندا زیاتر باوترە ،نیشانەکانیش بریتین لەمانە :-

- دروستبونی ئازار لە دەوری نینۆکەکە.
- گۆڕانی ڕەنگی نینۆکەکە.
- شکانی نینۆک.
- ئاوسان و جەراعەت کردن.
- سپی بوون یان زەردبونی نینۆک و جیابوونەوە لە بنکی نینۆکەکە.

*چۆن فەحسەکە ئەنجامدەدرێت؟
چۆنێتی ئەنجامدانی فەحسەکە دەوەستێتە سەر ئەو شوێنەی کە حاڵەتەکەی تێدا ڕویداوە ، بەشێوەیەک لەکاتی ڕودانی لەهەر شوێنێک لەو شوێنە جیاوازانەی لەش کەڕویاندا پزیشکی پسپۆڕ نمونەیەک وەردەگرێت لە و خانەی کە گومانی توشبونی لێدەکرێت پاشان لەژێر میکرۆسکۆب (ووردبینی تایبەت) پشکنینی بۆ دەکات ، ئەگەر خانە کەڕووەکان هێندە زۆر نەبون و گەشەیان نەکردبوو کە بەشێوەیەک بێت لەژێر ئامێری میکرۆسکۆبەکەدا نەبینرێت ئەوا دەبێت ئەو نمونەیەی کە وەرگیراوە زەرعی بۆ بکرێت ، ئەمەش دانانی نمونەکەیە لەژینگەیەکی تایبەت کە پاش ماوەیەک گەشە دەکات و دوای چەند ڕۆژێک ئەنجامەکەی دەردەچێت ، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا هەندێک لە کەڕوەکان گەشەیان هێواشە بۆیە لەوانەیە ئەنجامی زەرعکردنەکە لەم کاتەدا هەفتەیەک بخایەنێت.

---

چەند تێبینییەک /* لەکاتی دەرچونی دەرئەنجامی ئەم فەحسەدا ئەگەر دیار و ئاشکرابوو کە هەوکردن ڕوویداوە بەهۆی ئەم کەڕووەوە ئەوا پزیشکی تایبەت دەرمانی دژە کەڕووت بۆدادەنێت یان ئەگەر لە ئەندامی زاوزێی مێینە ڕویدابوو لەوانەیە بەشێوەی شاف دەرمانەکە بنوسێت ،...هتد ، ..

*ئەگەر چی ئەم هەوکردنە لە خوێن و دڵ و مێشکدا ڕوودانی کەمە و حاڵەتێکی باو نییە ، بەڵام ئەگەر ڕووبدات ئەوا مەترسیدارترە ، ڕوودانی حاڵەتی مەترسیدار بەگشتی لەو کەسانەدا ڕوودەدات کە سیستمی بەرگری لەشیان لاوازە.

*هەندێک لە دەرمانە دژە هەوکردنەکان لەوانەیە ببنە هۆکاری زیادبونی گەشەی ئەم کەڕوە بۆیە پێویستە لە ژێر ڕێنمایی و پزیشک و چاودێری تەندروستی دەرمان بەکاربهێنرێت.

---

# Vitamin D test

ڤیتامین D ڕۆڵێکی گرنگی هەیە لە تەندرووستی ئێسک و ددانەکان ، دوو شێواز یان دوو جۆر لە ڤیتامین D هەیە کە گرنگن بۆ خۆراکە ماددە ئەوانیش بریتین لە ڤیتامین D2 و ڤیتامینD3 ، ڤیتامین D2دەستمان دەکەوێ لە ڕێگەی خواردنی بەیانیان وەک شیر و بەرهەمە شیرەمەنییەکانی دیکە، بەڵام ڤیتامین D3 بەشێوەیەکی سەرەکی دەستمان دەکەوێت لەڕێگەی بەرکەوتنمان بە تیشکی خۆر هەروەها لەڕێگەی هەندێ خۆراکەوە ڤیتامین D3 دەستدەکەوێت وەک هێلکە و ماسی بەتایبەت سەلەموون...هتد..

لەناو جۆگاکانی خوێنی لەشماندا ڤیتامین D2 و ڤیتامین D3 دەگۆڕێن بۆ شێوەی سەرەکی ڤیتامین D کە ناودەبرێت بە 25 hydroxy vitamin D ، هەروەها ناسراوە بە 25 , D (OH) بۆیە لەڕێگەی فەحسی ڤیتامین D پێوانی ڕێژەی 25 D (OH) لەناو خوێن دەکرێت ، کەمی لەڕێژەی ڤیتامین D لە ئەنجامی ئەم فەحسە دەرخەری نەخۆشییەکانی ئێسک یان کێشە لە سیستمی خۆراک یان کێشەی دیکەی تەندرووستی.

بۆچی پێویستە فەحسی ڤیتامین D ئەنجام بدەین ؟

کاتێک نیشانەکانی کەمی و ناتەواوی لە ڕێژەی ڤیتامین D دەرکەوت ئەوا پێویستدەکات ئەم فەحسە ئەنجامبدەین ، نیشانەکانیش بریتین لەمانە :-

- لاوازبوونی ئێسک.
- نەرمبوون و زوو شکانی ئێسک.
- لاوازی و بێتاقەتی
- ئازاری ماسوولکە و ئێسک
- ئازاری پشت
- وەرینی قژ

هەروەها فەحسی ڤیتامین D ئەنجامدەدرێت بۆ ئەوکەسانەی کە مەترسییان زیاتر بۆ کەمی ڤیتامین D بەتایبەت بۆ ئەم کەسانە :-

- منداڵی شیرە خۆرە ، چوونکە منداڵ بەکەمی دەکەوێتە بەر تیشکی خۆر، هەروەها شیری دایک سەرچاوەیەکی لاوازە بۆ ڤیتامین D ، بۆیە ئاکادیمیایی ئەمریکی بۆ منداڵان ڕێنمایی دەدات لە پێدانی IU 400 ڕۆژانە بە منداڵان.

- ئەو کەسانەی کە بەتەمەنن ، چوونکە پێستیان بەباشی توانای وەرگرتنی ڤیتامین D نییە لەتیشکی خۆرەوە، وە گوورچیلەشیان بە باشی ناتوانێت ڤیتامین D بگۆڕێت بۆ شێوەیەکی چالاک.

- ئەو کەسانەی کە ڕەش پێستن ، توانای دەستکەوتنی ئەم ڤیتامینەیان کەمە لە تیشکی خۆرەوە.

- ئەو کەسانەی کە قەڵەون ، چوونکە چەوریە خانەکانیان پێکەوە دەنوسێن لەگەڵ ڤیتامین D بەمەش ڕێگری لێدەکەن کە بچێتە سوڕی خوێن.،بەڵام مژینی ڤیتامین D پێویستی بە چەوری هەیە ، بەڵام کە زیاد لە پێویست بوو ئەو حاڵەتەی سەرەوە درووست دەکات.

- نەخۆشی درێژخایەنی جگەر و گوورچیلەکان،وە هەندێ نەخۆشی دیکە وەک شێرپەنجە...
ئەو کەسانەی هەندێ دەرمان بەکاردێنن وەک Cholestyramine , anti seizure drugs anti, fungal drugs , HIV/Aids medicines...

دەرئەنجامی فەحسی ڤیتامین D دەرخەری چییە ؟
ئەگەر لە ئەنجامی فەحسەکەدا کەمی لە ڕێژەی ڤیتامین D بەدیکرا ئەوا لەوانەیە ئاماژە بێت بۆ یەکێک لەم حاڵەتانە...

- کەم بەرکەوتنمان بە تیشکی خۆر.
- بەشێوەیەکی باش ڤیتامین D مان دەست نەکەوێت لەخواردنەوە.
- هەبوونی کێشە لە مژینی ڤیتامین D لەخوێندا.

هەروەها ئەگەری بوونی کێشە هەیە لە جگەر و گوورچیلەکاندا ، بەڵام ئەگەر لە هەندێ حاڵەتی دەگمەن و کەمدا کە ڕوودەدات ڕێژەی ڤیتامین D بەرزبێت ئەوا ئەگەڕێتەوە بۆ زۆر بەکارهێنانی حەب و دەرمانی سەپلیمینتی دیکەی ڤیتامین D کە زۆری ڤیتامین D ئەندام و لوولەکانی خوێن تێکدەشکێنێت و زیانی هەیە.

---

ڕێژەی ئاسایی و نا ئاسایی ڤیتامین D چەندە ؟

ئەم ژمارانە لەوانەیە کەمێک گۆڕانکاری بەسەردا بێت لە تاقیگەیەکەوە بۆ تاقیگەیەکی دیکە.،یان بەپێی سەرچاوەی جیاواز...
-ئەگەر ڕێژەکەی 25 - 80 ng/ml بوو ، ئەوا باشترین ڕێژەیە، یان هەندێ سەرچاوەی تازە دەڵێن 70-50
-ئەگەر ڕێژەکە 10 - 24 ng/ml بوو ، ئەوا کەمی ڤیتامین D هەیە بەڵام بەشێوەیەکی کەم یان ئاسایی.بەپێی ڕێژەکەی.
-ئەگەر ڕێژەکەی لە 10 ng/ml کەمتر بوو ، ئەوا زۆر کەمە ڕێژەکەی.- وە ئەگەر لە 80 ng/ml زیاتر بێت ، ئەوا قۆناغی ژەهراوییبوونە بە ڤیتامینD ، کە ئەمەش مەترسیدارە.

---

## فەحسی چەوری سیانی :: Tryglicerides Test ::

لەڕێگەی ئەم فەحسەوە پێوانەی بڕی Tryglicerides دەکەین لە خوێندا ، دەزانن Tryglicerides چییە ؟.. بریتییە لە جۆرێکی چەوری لەلەشدا ، کاتێک ئێمە بڕێکی زۆر کالۆری دەخۆین و زیاتر لەوەی کە لەشمان پێویستی پێیەتی ، ئەوا ئەو کالۆریە زیادەیە دەگۆڕێت بۆ چەوری سیانی (Tryglicerides) پاشان ئەم چەوریە خەزندەکرێت لە خانە چەوریەکاندا..

بۆئەوەی لەداهاتوودا بەکاربهێنرێت لەکاتیکدا کە لەش پێویستی پێی بوو، کاتێک لەشمان پێویستی بە ووزە بوو ئەوا ئەو چەوریەی کە خەزن بووە (Tryglicerides) بەرەڵادەکرێتە ناو خوێن بەمەبەستی بەکارهێنانی وەک سەرچاوەی ووزە و سووتەمەنی بۆ ماسوولکەکان بۆ بەڕێوەچونی فرمانی ئاساییان.

بەڵام کاتێک کالۆری زیاترت خوارد بەراورد بەو چەوریەی کە دەسوتێت ئەوا ڕێژەی چەوری Trygliceridesلە خوێندا بەرزدەبێتەوە بەتایبەتی ئەو کالۆریەی کە لەسەرچاوەی کاربۆهیدرەیت و خۆراکی چەورەوە بەکاریدەهێنین ، بەرزبوونەوەی ڕێژەی Tryglicerides لە خوێندا مەترسی درووستدەکات لەسەر نەخۆشییەکانی دڵ ، بەتایبەت ڕوودانی جەڵدەی دڵ و جەڵدەی مێشک

ئەم فەحسە لە گرووپی فەحسی چەورییەکانە لە خوێندا (lipid profile) ووشەی lipid ئاماژەیە بۆ چەوری ، لەم زنجیرە فەحسەدا جۆرە جیاوازەکانی چەوری پێوانە دەکرێت وەک کۆلیسترۆل کە ماددەیەکی شێوە مۆمیەو لە هەموو خانەکانی لەشدا هەیە ، هەروەها (HDL) کە بریتییە لە چەوری سوودبەخش ، هەروەها (LDL) کە ئەمەیان بریتییە لە چەوری زیان بەخش ، ئەگەر لە فەحسدا ڕێژەی چەوری (LDL) و ڕێژەی چەوری Tryglicerides پێکەوە بەرز بوو ئەوا مەترسی زیاترت لەسەرە بۆ جەڵدەی دڵ و مێشک.(Heart attack & Stroke) ...

بۆچی پێویستە ئەم فەحسە ئەنجام بدەین ؟ ، کێن ئەو کەسانەی مەترسییان زیاترە بۆ بەرزی لەڕێژەی ئەم جۆرەی چەوری؟

هەرکەسێکی کامڵ و پێگەشتوو پێویستدەکات کە فەحسی کۆلیسترۆل بەگشتی و ئەم جۆرەی چەوری بەتایبەتی Tryglicerides ئەنجام بدات لەماوەی نێوان چوار بۆ شەش ساڵ جارێک ، بەڵام لەهەندێک حاڵەتدا پێویست دەکات بە ماوەیەکی کەمتر ئەم فەحسە دووبارە بکەینەوە چونکە هەندێک هۆکار و فاکتەر مەترسی زیاتر دەکات ، لەوانە :-

- ئەگەر لە خێزانەکەتدا کەسی توشبوی نەخۆشی دڵ هەبێت.
- کەسانی جگەرەکێش.
- ئەگەر کێشت زۆر بوو ، یان بەرەو کێش زیادی دەچووی.
- خۆراک و خواردنی نا تەندرووست.
- کەمی وەرزشکردن و سستی.
- بەرزی پەستانی خوێن و نەخۆشی شەکرە.
- تەمەن ، پیاوان لە ٤٥ ساڵ و زیاتر ، وە ئافرەتان لە ٥٠ ساڵی و زیاتر مەترسیان زیاترە بۆ توشبون بە نەخۆشییەکانی دڵ.

ئاساییانە ئەنجامدانی ئەم فەحسەش وەک زۆربەی فەحسەکانی دیکەی تاقیگە لەڕێگەی وەرگرتنی نمونەیەک لەخوێن دەبێت لە خوێنهێنەری دیوی ناوەوەی ئانیشک یان هەر خوێنهێنەرێکی دیکە کە گونجاوتر و لەبەردەستر بێت ، وا پێویستدەکات ماوەی ٩ بۆ ١٢ کاتژمێر لە پێش ئەنجامدانی ئەم فەحسە هیچ خواردن و خواردنەوەیەک نەخۆیت ، چونکە خواردن بەماوەیەکی کەم پێش وەرگرتنی نمونەی خوێنەکە لەوانەیە ئەنجامی فەحسەکە بگۆڕێت و ئەنجامێکی ناڕاست دەربچێت.

دەرئەنجامی ئەم فەحسە دەرخەری چییە ؟
پێوانەی ڕێژەی Tryglicerides بە یەکەی (mg/dL) پێوانە دەکرێت ، واتە mg ئاماژەیە بۆ ڕێژەی چەوری Tryglicerides لە هەر dL لە خوێندا.
ڕێژەکان بۆکەسێکی پێگەشتوو (adult) بەم شێوەیەی خوارەوەیە :-
- ئەگەر لە ئەنجامی فەحسەکەدا ڕێژەی Tryglicerides کەمتر بوو لە 150 mg/dL ئەوا ڕێژەکەی ئاساییە.(Normal)
- ئەگەر ڕێژەکەی لەنێوان (150 -199 mg/dL) بوو ئەوا لە سنووری بەرزبونەوەدایە (Borderline High)
- ئەگەر ڕێژەکەی لەنێوان (200-499 mg/dL) بوو ئەوا ڕێژەکەی بەرزە.(High level)
- ئەگەر ڕێژەکەی لە (500 mg/dL) زیاتر بوو ئەوا ڕێژەکەی زۆر بەرزە و مەترسیدارە.

---

## فەحسی زەرعی کەڕوو
## Fungal Culture Test

لەڕێگەی ئەم فەحسەوە یارمەتیمان دەدات لە دەستنیشانکردنی هەرجۆرە ئینفێکشنێک کە هۆکارەکەی کەڕوو بێت ، واتە هەر حاڵەتێکی پزیشکی کە بەهۆی بەرکەوتن بە کەڕووەوە درووست بوبێت ، ئەگەر پێناسەیەک بۆ کەڕوو بکەین ئەوا دەتوانین بڵێین بریتییە لەو میکرۆبەی کە دەژی لە هەوا و خاک و ڕووەکەکان تەنانەت لەسەر لەشی ئێمەش دەژی .

زیاتر لە ملیۆنێک جۆری جیاواز لە کەڕوو هەیە کە زۆربەیان بێ زیانن بەڵام هەندێکیان دەبنە هۆی درووستبوونی حاڵەت و ناتەواوی پزیشکی ، بەشێوەیەکی گشتی دوو جۆری سەرەکی لە هەوکردن بەهۆی کەڕوو هەیە ، ئەوانیش بریتیین لە :-

*ڕووکەشی یان دەرەکی -: (Superficial) کاردەکەنە سەر ئەو بەشانەی لەش کە لە ڕووکەشی دەرەوەی لەشن ، کە ئەمەیان زیاتر باوترە و کاردەکاتە سەر پێست و نینۆک و ناوچەکانی زاوزێ. نموونەی ئەو حاڵەتان وەک پێی وەرزشەوان کە هۆکارەکەی کەڕووە ، هەروەها حاڵەتی (ringworm)کە نەخۆشییەکی پێستە ئەمەیان کرم نییە بەڵکو کەڕوویەکە دەبێتە هۆی درووستبونی پەڵەی بازنەیی لەسەر پێست.

لە کاتێکدا ئەم حاڵەتانە مەترسیدار نین وە ئەم جۆرەیان (superficial) دەبێتە هۆی خوران و پەڵەی توێکڵ فڕێدەر یان بۆناوی لەسەر پێست.

*سیستمی لەش یان ناوەکی -: (Systemic) ئەمەیان کاردەکەنە سەر سیستم و بەشەکانی ناوەوەی لەش ، وەک سییەکان یان خوێن و بەشە ناوەکییەکانی دیکەی لەش . کە ئەم جۆرەی هەوکردنە بەهەحی کەڕووەوە دەکرێت بە تەواوی مەترسیدار بێت ، بەشی هەرەزۆری کەڕوە مەترسیدارەکام کاردەکەنە سەر کەسێک کە سیستمی بەرگری لەشی لاواز بێت ، وە هەندێکی دیکە لەو کەڕوانە کاردەکەنە سەر کەسێک کە ئیشی ڕووەکی و کێڵگەیی بکات نموونەی ئەو کەڕوانەش وەک : Sporothrix ، Schenckii هەرچەندە کەڕوو هەیە کە بەهۆی شوێن پێوەدانی گیانداران زیان بە جەستە دەگەیەنێت کە بەزۆری بەهۆی پشیلە ڕوودەدات ، کەڕووی Sporothrix دەتوانێت ببێتە هۆی دروستبونی برینی پێست و نەخۆشی سییەکان و کێشەکانی جومگە.

"هەردوو جۆرەکەی کە لەسەرەوە باسمان کرد دەتوانین لەڕێگەی ( Fungal culture test) دەستنیشانیان بکەین.

چ کاتێک پێویستە ئەم فەحسە ئەنجام بدەین ؟
کاتێک نیشانەکانی تووشبون و بەرکەوتن بە کەڕوو بەدیکرا پێویستدەکات ئەم فەحسە ئەنجام بدرێت ، نیشانەکانیش جیاوازە بەپێی ئەو جۆرە جیاوازانەی کە لەسەرەوە باسمان کردن ، ئەگەر سەرەتا باسی نیشانەکانی جۆری یەکەم بکەین کە ڕووکەشی یان دەرەکی (Superficial) بوو ، ئەوا هەندێ نیشانە دەردەکەون ، لەوانە :-

- دەووستبونی پەڵەی سوور.
- خورانی پێست.
- دروستبونی خوران یان گۆڕان لە ئەندامی زاوزێی مێینە کە ئەو حاڵەتە ناودەبرێت بە Vaginal yeast.
- دروستبونی پێکهاتەی سپی لەناو دەم کە لە حاڵەتی mouth yeast ڕوودەدات.
- ڕەقبوون یان زوو شکانی نینۆک.

ئەگەر باسی نیشانەکانی جۆری دووەم بکەین کە بریتی بوو لە سیستمی لەش یان ناوەکی (Systemic)، نیشانەکان لێرەدا مەترسیدارن وەک :-

- تـــا
- ئازاری ماسوولکە.
- سەرئێشە.
- موچرکە یان لەرز.
- هێڵنجدان.
- خێرا لێدانی دڵ.

تەکنیک و ڕێگاکانی ئەنجامدانی فەحسی زەرعی کەڕوو..

ڕێگا باوەکانی ئەنجامدانی زەرعی کەڕوو بریتین لەم ڕێگا جیاوازانەی خوارەوە :-
-کڕاندنی پێست و نینۆک ... ، ئەم ڕێگایە بەکاردێت بۆ دیاریکردن و دەستنیشانکردنی هەوکردنی کەڕوو کە لە ڕووکەشی پێست و نینۆکەکاندا ڕوویدابێت ، لەم ڕێگایەدا پزیشکی پسپۆر ئامراز و ئەداتێکی تایبەت بەکاردێنێت بۆ وەرگرتنی نمونەیەک لە پێست یان نینۆک.

- بەکارهێنانی سواب یان سڕەر .... ، ئەم ڕێگەیان بەکاردێن بۆ پشکنین لەو هەوکردنە کەڕوانەی کە لە دەم یان ئەندامی زاوزێی مێینەدا ڕوودەدات ، هەروەها بۆ هەندێ حاڵەتی تایبەت کە لە پێستدا ڕوودەدات بەکاردێت ، تەکنیکی ئەنجامدانی ئەم ڕێگایە پزیشکی پسپۆڕ سوابێکی تایبەت بەکاردێنێت بۆ کۆکردنەوەی شانەیەک یان شلەیەک لە ناو ئەو بەشانەی کە باسمان کردن لەسەرەوە ، یان هەر برینێکی کراوە.

- فەحسی خوێن .... ، لەڕێگەی وەرگرتنی نموونەیەک لە خوێن پشکنین دەکرێت بۆ هەبوونی کەڕوو لە خوێندا.

- فەحسی میز ....، لەڕێگەی وەرگرتنی نموونەیەک لو میز پشکنین دەکرێت بۆ هەبوونی کەڕوو بەتایبەت بۆ حاڵەتی بوونی کەڕوو لە ئەندامی زاوزێی مێینە.

- زەرعی بەڵغەم ......، بەڵغەم پێکهاتەیەکی لینجە کە جیاوازە لە لیک و دەردراوەکانی دیکە ،ئەم ڕێگایە زیاتر بەکاردێت بۆ دەستنیشانکردنی بوونی هەوکردنی کەڕوو لە سییەکاندا ، لەم فەحسەدا داوا لە کەسەکە دەکرێت کە هەوڵبدات نمونەیەکی بەڵغەم لە دەفرێکی تایبەتدا کۆبکاتەوە بە مەبەستی پشکنین.

دوای کۆکردنەوەی سەرجەم نموونەکان دەنێردرێت بۆ تاقیگە ، وە مەرج نییە یەکسەری ئەنجامەکەی دەربچێت لە زەرعی کەڕوودا پێویستە بڕی تەواوەتی لە کەڕوو هەبێت بۆئەوەی لە فەحسەکەدا دەربکەوێت وە هەندێ جار ڕۆژێک یان دوو ڕۆژی پێویستە لە هەندێ حالەتیشدا دەگاتە هەفتەیەک هەتا ئەنجامەکەی دەردەچێت ، بەگشتی ماوەی تەواوبوونی ئەنجامەکەی پشت دەبەستێت بە جۆرو توندی ئەو حاڵەتەی کە بەهۆی کەڕووەکەوە ڕوویداوە ، وە لە ئەنجامدا ئەگەر کەڕوو بوونی هەبوو ئەوا دەرخەری ئەوەیە کە هەڵگری حالەتی تووشبووی بە کەڕوو.

---

## فەحسی (FOBT)
## Fecal Occult Blood Test (FOBT)

لەم فەحسەدا پشکنین و ووردبینی دەکرێت بۆ بوونی خوێن لە پیسایی ، دەستەواژەی (Occult) لەم فەحسەدا ئاماژەیە بۆئەوەی کە بە چاوی ئاسایی ئەو خوێنە نابینرێت ، بوونی خوێن بە پیسایی هۆکاری سەرەکی لەوانەیە بوونی خوێنبەربوون بێت لە ڕێڕە و سیستمی هەرسدا ئەمەش لای خۆیەوە چەندین هۆکاری دیکەی هەیە ، لەوانە :-

- مایەسیری.
- برین (قرحە.(
- حاڵەتی (Colitis) کە جۆرێکە لە هەوکردن لە ڕیخۆڵەکان.

*هەروەها بوونی خوێن لە پیساییدا لەوانەیە هەندێک جار ئاماژە و نیشانەیەک بێت بۆ جۆرێکی شێرپەنجە کە ناسراوە بە (Colorectal Cancer) ئەم شێرپەنجەیە دەستپێدەکات و دروستدەبێت لە کۆلۆن یان لە کۆم ، ئەم جۆرەی شێرپەنجە دووەم هۆکاری پەیوەندیدارە لەو جۆرانەی شێرپەنجە کە دەبنە هۆی مردن لە نەتەوە یەکگرتووەکانی ئەمریکادا، هەروەها سێیەم باوترین جۆرەکانی شێرپەنجەیە لە پیاوان و لە ئافرەتاندا ، لە ڕێگەی ئەم فەحسەوە (FOBT) دەتوانرێت بەزوویی ئەم جۆرەی شێرپەنجە هەستی پێبکرێ و بدۆزرێتەوە..

چونکە هەتا زووتر دەستنیشان بکرێت ئەوا چارەسەری کاریگەرتر و سەرکەوت و تر دەبێت.
بە شێوەیەکی گشتی ئەم فەحسە دوو جۆرە ئەوانیش بریتیین لە (gFOBT) و (iFOBT) ، هەریەک لەم ڕێگایانە تەکنیکی خۆی هەیە بۆ ئەنجامدانی.

دەرئەنجامی ئەم فەحسە دەرخەری چییە ؟
ئەگەر ئەنجامی ئەم فەحسە پۆزەتیڤ (Positive) بوو ئەوا نیشانەی ئەوەیە خوێنبەربوون هەیە لە هەرشوێنێک لە سیسیتم و ڕێڕەوی هەرسدا ، بەڵام مەرج نییە ئەگەر ئەنجامەکەی پۆزەتیڤ بوو دەرخەری شێرپەنجەبێت بەڵکو حاڵەتی دیکەش هەیە وەک ئەوانەی لە سەرەتادا باسمان کردن ، بۆیە هەرکاتێک پۆزەتیڤ بوو دەرئەنجامی ئەم فەحسە ئەوا دکتۆر پەنا دەباتە بەر ڕێگایی دیکە پشکنینی پێدەکات بۆ دڵنیابوون لە حاڵەتی کەسەکە ، وەک.Colonoscopy

لە کۆتایشدا ئەوەی ماوە بیڵێم کە هەندێ شت کاریگەری دروست دەکات لەسەر دەریەنجامی ئەم فەحسە وەک بەکارهێنانی دەرمان لە گرووپی (NSAIDs) نمونەی دەرمانەکانیش وەک
ibuprofen , Naproxen , ..یان aspirin کە بۆماوەیی حەوت ڕۆژ پێش ئەنجامدانی فەحسەکە کاریگەری درووستدەکات لەسەر ئەنجامی فەحسەکە.
زیاتر لە 250 mg ڤیتامین C لە ڕۆژێکدا کە وەربگیرێت ئەمەش کاریگەری دروست دەکات لەسەر نەرێنی بوونی ئەنجانی فەحسەکە واتە بە نیگەتیڤ دەردەچێت ئەگەرچی خوێنبەربوونیش بوونی هەبێت.

---

## فەحسی فیریتین
## Ferritin Blood Test

فەحسی فیریتین ئەنجامدەدرێت بۆ زانینی ڕێژەی فیریتین لە خوێندا . فیریتین پرۆتینێکە بەشێوەی ماددەی ئاسنی خەزنکراو لە ناو خانەکانی لەشماندا ، واتە ئاسنی خەزنکراو لە خانەکانی لەشماندا ناودەبرێت بە فیریتین.
مادەی ئاسن پێویستە بۆ دروستبونی خانەکانی خڕۆکە سوورەکان بەشێوەیەکی تەندروستانە خڕۆکە سوورەکانیش ئۆکسجین هەڵدەگرێت لە سییەکاندا و دەیگوازێتەوە بۆ ئەندامەکانی لەش ، هەروەها ئاسن پێویستە بۆ تەندرووستی ماسوولکە خانەکان و مۆخی ئێسک و هەروەها بۆ بەڕێوەچوونی فرمانی ئاسایی خانەکان.

ڕێژەی ئاسایی فیریتین چەندە لە پیاوان و ئافرەتاندا ؟
ڕێژەی ئاسایی فیریتین لە پیاواندا بریتییە لە 12 - 300 ng/mL ، وە لە ئافرەتاندا ڕێژەیی ئاسایی بریتییە لە 12 - 150 . ng/mL
کورتکراوەی ng/mL ئاماژەیە بۆ .nanograms per milliliter of blood
ئەم ژمارە ئاساییانەی سەرەوە لەوانەیە لە تاقیگەیەکەوە بۆ تاقیگەیەکی دیکە کەمێک بگۆڕێت بەڵام بەشێوەیەکی گشتی ئەو ڕێژەیەیە کە لەسەرەوە باسمان کرد.

چ کاتێک پێویست دەکات ئەم فەحسە ئەنجامبدرێت ؟
ئێمە پێویستە ئەم فەحسە ئەنجامبدەین کاتێک نیشانەکانی کەمی ماددەی ئاسن و زۆری ماددەی ئاسن دەرکەوتن ، نیشانەکانیش بریتین لەمانەی خوارەوە :-
*نیشانەکانی کەمی ماددەی ئاسن ..
- زەردباوبوونی پێست.
- شەکەتی و ماندوویی.
- هەستکردن بە لاوازی.
- سەرگێژی و ووڕی.
- هەناسە کورتی.
- خێرابوونی لێدانی دڵ.

* نیشانەکانی بەرزی ڕێژەی ئاسن ..
- ئازاری جوومگەکان.
- ئازااری سک.
- کەمبوونی ووزە.
- کەمبوونی کێشی لەش.

چۆن ئەم فەحسە ئەنجامدەدرێت ؟
ئەم فەحسە بە وەرگرتنی نموونەیەک لە خوێن ئەنجامدەدرێت ، وا باشترە بۆ ماوەی ١٢ کاتژمێر پێش ئەنجامدانی ئەم فەحسە خواردن نەخورێت بۆیە بەزۆری لە بەیانیاندا ئەم فەحسە ئەنجامدەدرێت.

دەرئەنجامی ئەم فەحسە دەرخەری چییە ؟
ئەگەر لە ئەنجامی ئەم فەحسەدا ڕێژەکەی نزمتر بوو لەڕێژەی ئاسایی ئەوا دەرخەری کەمخوێنییە بەهۆی کەمی ماددەی ئاسن کە ناسراوە بە (iron deficiency anemia) کە باوترینی جۆرەکانی کەمخوێنییە و تێیدا بەشێوەیەکی تەواوەتی و پێویست خڕۆکە سوورەکانی خوێن دروست نابن ، کەمخوێنی بەهۆی کەمی ماددەی ئاسن هۆکارە بۆ دروستبونی کێشە و ناتەواویەکانی دڵ.

بەڵام ئەگەر لە ئەنجامی ئەم فەحسەدا ڕێژەی فیریتین زیاتربوو لە ڕێژەی ئاسایی خۆی ئەوا دەرخەری ئەوەیە کە ڕێژەیی ئاسن لە لەشدا بەرزە.

*ئەو حاڵەتانەی کە دەبنە هۆی بەرزبوونەوەی ڕێژەی ئاسن بریتین لە :-
- نەخۆشییەکانی جگەر.
- بەکارهێنانی ئەلکهول و خراپ بەکارهێنانی.
- حاڵەتی( Hemochromatosis ) کاتێک ڕوودەدات کە ڕێژەی ئاسنی خەزنکراو لە لەشدا بەشێوەیەکی نائاسایی بەرزبێتەوە (iron overload) ، ئەو ماددە ئاسنە زیادەیە کەڵەکەدەبێت لە شانەکانی جگەردا و دەبێیە هۆی هەوکردنی درێژخایەنی جگەر و نەخۆشی جگەر و عجزی جگەر ،هەروەها ئەم ماددە ئاسنە زیادەیەش زۆرجار لە پەنکریاس و دڵیشدا کۆدەبێتەوە و دەبێیە هۆی درووستبونی گرفت، ئەم حاڵەتە دەکرێت نەخۆشییەکی بۆماوەیی بێت.

لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا مەرج نییە ڕێژەی نائاسایی لە فەحسی فیریتین دەرخەری ئەو حاڵە تەندروستیانە بێت کە لەسەروە باسمان کردن بەڵکو بەکارهێنانی هەندێک دەرمان ڕێژەکەی زیاد و کەم دەکات بۆیە لەکاتی ئەنجامدانی ئەم فەحسەدا پزیشک ئاگادار بکەرەوە لە بەکارهێنانی هەرجۆرە دەرنانێک.

---

فەحسی ڕێژەی کۆلیسترۆل
Cholesterol level test

کۆلیسترۆل بریتییە لە ماددەیەکی چەوری شێوە مۆمی کە لە هەموو خانەکانی لەشدا بوونی هەیە ، جگەر کۆلیسترۆل درووستدەکات هەروەها لە ڕێگەی خواردنەوە کۆلیسترۆڵمان دەستدەکەوێت ، لەشی مرۆڤ پێویستی بە بڕی پێویست و تەندرووستی کۆلیسترۆل هەیە بۆ بەڕێوەچونی فرمانەکانی بەڵام کاتێک ڕێژەی کۆلیسترۆل بەرزبویەوە و لە ڕێژەی ئاسایی زیاتربوو ئەوکاتە دەبێتە هۆی مەترسی بۆ سەر تەندروستی لەش بەتایبەت بۆ ڕوودانی نەخۆشییەکانی دڵ و بۆریە خوێنەکانی دڵ.

چۆن پێوانی ڕێژەی کۆلیسترۆل بکەین ؟
بۆ کەسێک کەتەمەنی 20 ساڵ یان زیاتر بێت ئەوا وا پێویست دەکات کە بەلایەنی کەمەوە پێنج ساڵ جارێک فەحسی کۆلیسترۆڵ بکات ، ڕێژەی کۆلیسترۆل ئاساییانە لەڕێگەی وەرگرتنی نموونەیەکی خوێن دەکرێت (Lipoprotein panel) ، وا پێویستە لە پێش ئەنجامدانی ئەم فەحسە بە 9 - 12 کاتژمێر هیچ خواردن و خواردنەوەیەک نەخورێت جگە لە خواردنەوەی ئاو کە ئەمەیان ئاساییە ..

لەڕێگەی ئەم فەحسەوە کۆمەڵێک زانیاریمان دەستدەکەوێت لەوانە :-

- کۆلیسترۆلی گشتی : (Total cholesterol) ڕێژەی کۆی گشتی کۆلیسترۆڵ لە خوێندا کە دووجۆرە ، کۆلیسترۆلی سوودبەخش (HDL) ، لەگەڵ کۆلیسترۆلی زیانبەخش.(LDL)

- ڕێژەی کۆلیسترۆلی زیانبەخش (Low Density Lipoprotein ) ، کە سەرچاوەی سەرەکی ئەم کۆلیسترۆلە ئەوەیە کە نیشتووە لە دیوی ناوەوەی لوولە خوێنەکاندا و دەبێتە هۆی بلۆک بوونیان.

- ڕێژەی کۆلیسترۆلی سوودبەخش (High Density Lipoprotein) ، ئەم جۆرەیان بۆیە سوودبەخشە چونکە دەبێتە هۆی لابردنی ئەو کۆلیسترۆلە زیانبەخشەی کە لە ناو لوولە خوێنەکان کەڵەکە بووە.

- ڕێژەی Triglycerides ، جۆرێکی دیکەیە لە چەوری کە بەرزبونەوە لە ڕێژەکەی مەترسی زیاتر دەکات بۆ نەخۆشییەکانی دڵ بە تایبەت لە ئافرەتاندا.

ئەنجامی ڕێژەکانی کۆلیسترۆل لە فەحسدا :-

ڕێژەکانی کۆلیسترۆل پێوانە دەکرێت بە یەکەی milligrams per deciliterکورتکراوەکەی لە ئەنجامی فەحسەکاندا بریتییە لە mg/dL ، ڕێژەکانیش بەم شێوەیەی خوارەوە دەبن...

ئەگەر ڕێژەی کۆلیسترۆلی گشتی (Total cholesterol) لە فەحسدا کەمتر بوو لە 200 mg/dL ئەوا ڕێژەیەکی باش و خوازراوە ، ئەگەر ڕێژەکەی 200 - 239 mg/dL بێت ئەوا ڕێژەکەی لە سەروو ئاساییە بەڵام بەشێوەیەکی مەترسیدار نییە ، واتە لە سنووری بەرزبونەوەدایە ، بەڵام ئەگەر ڕێژەکەی 240 mg/dL و بەرزتر بوو ئەوا قۆناغی بەرزی کۆلیسترۆڵە.

ئەگەر ڕێژەی کۆلیسترۆڵی زیانبەخش (LDL) کەمتربوو لە 100 mg/dL ئەوا ڕێژەیەکی باشە ، ئەگەر ڕێژەکەی 100 - 129 mg/dL بوو ئەوا بە نزیکەی ڕێژەیەکی باشە ، ئەگەر ڕێژەکەی 130 - 159 mg/dL بوو ئەوا لە سنووری بەرزیدایە ، ئەگەر ڕێژەکەی 160 - 189 mg/dL بوو ئەوا ڕێژەکەی بەرزە ، ئەگەر ڕێژەکەی 190 mg/dL بەرزتر بوو ئەوا زۆر بەرزە ڕێژەکەی.

ئەگەر ڕێژەی کۆلیسترۆڵی سوودبەخش (HDL) لە 60 mg/dL یان بەرزتر بوو ئەوا ڕێژەیەکی باشە واتە دەتوانین بڵێین مەترسی نەخۆشییەکانی دڵمان نییە ، ئەگەر ڕێژەکەی 40 - 59 mg/dL بوو ئەوا بەنزیکەی ڕێژەیەکی باشە ، بەڵام ئەگەر ڕێژەکەی لە 40 mg/dL کەمتر بوو ئەوا مەترسی دروەستدەکات بۆ تووشبون بە نەخۆشییەکانی دڵ.

جۆری چەوری Triglycerides ڕێژەی ئاسایی ئەم جۆرەیان ئاساییانە پێویستە کەمتربێت لە 150 mg/dL، بەڵام ئەگەر ڕێژەکەی لە 159 - 199 mg/dL بوو ئەوا لە سنووری بەرزیدایە ، وە ئەگەر لە 200 mg/dLزیاتر بوو ئەوا مەترسیدارە ، لە هەردوو حاڵەتەکەدا پێویستی بە چارەسەری پزیشکی دەبێت.

چی کاریگەری دروەستدەکات بۆ سەر ڕێژەی کۆلیسترۆڵ؟

کۆمەڵێک شتی جۆراوجۆر هەیە کە کاریگەری درووستدەکات لەسەر ڕێژەی کۆلیسترۆل ، ئەمانەی خوارەوە چەند خاڵێکن کە دەتوانین ئەنجامیان بدەین بۆ کەمکردنەوەی ڕێژەی کۆلیسترۆڵ :-

- سیستمی خۆراک :-ئەو خۆراکانەی کە دەوڵەمەندن بە چەوری تێر و کۆلیسترۆل ڕێژەی کۆلیسترۆل لە خوێندا بەرزدەکەنەوە ، بۆیە دوورکەوتنەوە و کەم خواردنی ئەو جۆرە خۆراکانە ڕێگەیەکە بۆ کەمکردنەوەی بەرزی ڕێژەی کۆلیسترۆڵ ، نموونەی ئەو خۆراکانەش بریتین لە گۆشت و هەندێک لە بەرهەمە شیرەمەنییەکان و چۆکولاتە...هتد...

- کێشی لەش :- قەڵەوی زیادی کێشی لەش یەکێکە لە مەترسییەکانی تووشبون بە نەخۆشییەکانی دڵ بۆیە دابەزاندنی کێش و خۆپاراستن لە قەڵەوی ڕێگایەکە بۆ کەمکردنەوەی ڕێژەی کۆلیسترۆڵی گشتی و کۆلیسترۆڵی زیانبەخش و Triglycerides ، هەروەها هۆکارێکە بۆ زیادبوونی کۆلیسترۆڵی سوودبەخش (HDL) کە سەرئەنجامی ئەمانەش دوورمان دەخاتەوە لە مەترسی تووشبون بە نەخۆشییەکانی دڵ.

- وەرزشکردن :- جووڵەی فیزیایی و وەرزشکردن ڕێگایەکە بۆ کەمکردنەوەی کۆلیسترۆڵی زیانبەخش و زیادبوونی کۆلیسترۆلی سوودبەخش لە ڕیگەی دابەزاندنی کێشەوە ، کە سەرەنجامی ئەمانەش مەترسی کەمتردەکاتەوە بۆ تووشبون بە نەخۆشییەکانی دڵ ، بۆیە وا پێویستە بەلایەنی کەمەوە ڕۆژانە نیو کاتژمێریش بێت وەرزش و چالاکی ئەنجامبدەین.

- جگەرەکێشان :- جگەرەکێشان هۆکارێکە بۆ کەمبوونەوەی ڕێژەی کۆلیسترۆلی سوودبەخش (HDL)، کەمبوونەوەی ڕێژەی ئەم جۆرەی کۆلیسترۆڵ مەترسی زیاددەکات بۆ تووشبون بە نەخۆشییەکانی دڵ ، چونکە ئەم جۆرەی کۆلیسترۆڵ دەبێتە هۆی لابردنی کۆلیسترۆلی زیانبەخش (LDL)لە خوێنبەرەکان.

- تەمەن و ڕەگەز :- پیاوان و ئافرەتان بە زیادبوونی تەمەنییان ڕێژەی کۆلیسترۆڵی زیان بەخش بەرەو بەرزبونەوە دەڕوات ، بەڵام لە ئافرەتاندا هەتا تەمەنی وەستانی سوڕی مانگانە کە ئاساییانە تەمەنی 55ساڵی و زیاتر هەتا ئەم تەمەنە پیاوان زیاتر مەترسییان زیاترە بەڵام لەم تەمەنە بەدواوە واتە بە زیادبوونی تەمەنیان لەن قۆناغەوە ئافرەتان مەترسییان زیاتر دەبێت بۆ بەرزبونەوەی ڕێژەی کۆلیسترۆلی زیانبەخش ، لەبەر ئەم هۆیە بە زیادبوونی تەمەن نەخۆشییەکانی دڵ و پەستانی خوێن زیاددەکات.

قۆناغی چارەسەریش بۆ بەرزی پەستانی خوێن سەرەتا ڕەچاوکردنی ئەو خاڵانەی لەسەرەوە باسمان کرد وەک هەڵبژاردنی سیستمی خۆراکی تەندرووست لەگەڵ وەرزشکرنێکی گوونجاو و..... ئەمانە ڕێگایەکن بۆ خۆپاراستنمان لە بەرزی کۆلیسترۆل و نەخۆشییەکانی دڵ ، بەڵام لە کاتێکدا لە کۆنترۆل دەرچوو ڕێژەکەی ئەوا لە ژێر ڕێنمایی پزیشک دەتوانیت دەرمان بەکاربهێنیت کە کۆمەڵەی دەرمانەکانی کۆلیسترۆل کە باوترینن ناسراوە بە. ( Statin )

---

## Hepatitis Panel
## فەحسی خوێن بۆ دیاریکردنی هەوکردنی ڤایرۆسی جگەر

هەوکردنی جگەر جۆرێکە لە نەخۆشییەکانی جگەر بەزۆری بەهۆی ڤایرۆسەوە ڕوودەدات کە سەرەکیترینیان بریتین لە هەوکردنی ڤایرۆسی جۆری A، هەوکردنی ڤایرۆسی جۆری B ، هەوکردنی ڤایرۆسی جۆری .... C ئەمانە باوترین هۆکارن بۆ تووشبون بە هەوکردنی جگەر ، لەبەر ئەم هۆکارە لەڕێگەی ئەنجامدانی ئەم فەحسەوە نمونەیەک لە خوێن وەردەگیرێت بۆ دیاریکردن و دەستنیشانکردنی هەرجۆرێک لەو ڤایرۆسانە کە بوبێتە هۆی هەوکردنی جگەر.

ڤایرۆسە جیاوازەکان بە شێوەی جیاواز بڵاودەبنەوە ، هەروەها دەبنە هۆی دەرکەوتنی نیشانەی جیاواز ، بەم شێوەیە :-
- هەوکردنی ڤایرۆسی جۆری A بەزۆری دەگوازرێتەوەو بڵاودەبێتەوە لەڕێگەی بەرکەوتن بە شوێن پێشاو پیسایی ، هەروەها خواردنی خۆراکی هەڵگری ڤایرۆس ، هەروەها لەڕێگەی ئەنجامدانی کاری سێکسی لەگەڵ کەسی تووشبوو ، بەڵام زۆربەی کەس ئەم ڤایرۆسە تێدەپەڕێنن بەبێ ئەوەی زیانی گەورە بەر خانەکانی جگەر بکەوێت.

-هەوکردنی ڤایرۆسی جۆری B بڵاودەبێتەوە لەڕێگەی بەرکەوتن بە شلەو فلودی لەش ، وەک بەرکەوتن بە خوێنی پیس بوو ، بۆ هەندێ کەس لەوانەیە بەزوویی چاکبێتەوە و ڤایرۆسەکە تێپەڕێنێت ، بەڵام لای هەندێک کەسی دیکە لەوانەیە ببێتە هۆی نەخۆشی و هەوکردنی درێژخایەنی جگەر.

- هەوکردنی ڤایرۆسی جۆری C ئەم جۆرەیان بەزۆری بڵاودەبێتەوە لەڕێگەی بەرکەوتن بە خوێن ، ئەمەش بەزۆری لەڕێگەی دەرزی پیس بوو بەو ڤایرۆسە ، هەروەها لەڕێگەی ئەنجامدانی کاری سێکسی لەگەڵ کەسی تووشبوو ، هەوکردنی ڤایرۆسی جۆری C هەندێک جار دەبێتە هۆی نەخۆشی درێژخایەنی جگەر لەگەڵ Cirrhosis کەجۆرێکی نەخۆشی درێژخایەنی جگەرە.

ئەم فەحسە کاتێک بەکاردێت کە نیشانەکانی نەخۆشی جگەر و زیان بەرکەوتن بە جگەر ڕوویدا ، نیشانەکانیش بریتین لەمانە :-

- زەردوویی ، حاڵەتێکە تێیدا پێست و چاو بەرەو زەردباوی دەڕوات.
- بەرزبونەوەی پلەی گەرمی (تـــا.(
- کەمبنونەوەی ئارەزوی خواردن.
- بێهێزی و لاوازی.
- تاریکبونی ڕەنگی میز.
- زەردباوبوونی ڕەنگی پیسایی.
- هێڵنجدان و ڕشانەوە.

لە دەرئەنجامی ئەم فەحسەدا ئەگەر نیگەتیڤ بوو (Negative) ئەوا هەڵگری ڤایرۆدەکە نییە ، بەڵام ئەگەر پۆزەتیڤ بوو (Positive) ئەوا هەڵگری ڤایرۆسەکەیە ، هەرچەندە لەو کاتانەدا کە ئەنجامەکەی پۆزەتیڤ دەردەچێت واباشترە وردتر پشکنین بکرێت بۆ زیاتر دڵنیابوون.

---

فەحسی غوددە

# Thyroid stimulating hormone (TSH)

سایرۆید هۆرمۆنێکە لەلایەن ژێر مێشکە ڕژێنەوە هان دەدرێت ..هۆرمۆنەکانی سایرۆید ڕۆڵێکی گرنگیان هەیە لە ڕێکخستنی ئەو ووزەیەی کە لەش بەکاری دێنێت..

ڕێژەی ئاسایی micro Iu/ml(TSH)0.25-5

ئەگەر لە فەحسدا ڕێژەی سایرۆی (TSH) بەرز بێت ، ئەوا ئاماژەیە بۆ کەم چالاکی سایرۆیدە ڕژێن Hypothyroidism، وە ئەگەر زۆر بەرزیش بێت ئەوا لەوانەیە نەخۆشەکە کێشەی لە ژێر مێشکە ڕژێندا هەبێت....(pituitary gland)

بەڵام ئەگەر لەم فەحسەدا ئەنجامەکەی نزمتر بوو لە ڕێژەی ئاسایی خۆی ئەوا ، سایرۆیدە ڕژێنی زیاد لە پێویست چالاکە..Hyperthyroidism
ئایا دەزانی TSH ئەگەر ژمارەکەی کەمبوو ئەوا ئەوە دەگەیەنێت کە ڕژێنی سایرۆیدت زیاد لە پێویست چالاکەHyperthyroidism، واتە بە پێچەوانەی ئەوانی دیکەوەیە..
نیشانەکانی زیاد لەپێویست چالاک بوونی سایرۆید Hyperthyroidism ئەمانەن..

- خێرا لێدانی دڵ
- کەمبوونی کێشی لەش
- قەڵەقی
- کەم خەوی
- شڵەژاوی و ئارەقکردنەوە و بەرگەنەگرتن بەرامبەر بەرزی پلەی گەرما....هتد

نیشانەکان کەم چالاکی سایرۆیدە ڕژێن Hypothyroidism ئەمانەن:

- هێواش لێدانی دڵ
- زیادبوونی کێش
- بێتاقەتی و لاوازی و بێهێزی
- بەرگە نەگرتن بەرامبەر نزمی پلەی گەرما...هتد

هەروەها ڕژێنی سایرۆید بەرپرسە لەکۆنترۆڵی دەردانی دوو هۆرمۆن ، ئەوانیش..T4 , T3
Thyroxine (T4) (60 - 120) nmol/L
Triiodothyronine (T3) (0.9 - 2.33) nmol/L

---

# Carbon Dioxide ($CO_2$) in Blod

دوانۆکسیدی کاربۆن گازێکی بێبۆن و بێ ڕەنگە ، گازی دوانۆکسیدی کاربۆن پاشماوەیەکی بەرهەمهاتووی لەشە خوێن هەڵدەستێت بە گواستنەوەی بۆناو سییەکان لەوێشەوە لەڕێگەی کرداری هەناسەدانەوە دەکرێتە دەرەوەی لەش ، ئەمەش وەک کردارێکی ئاساییانەی ڕۆژانەمان هەناسەدان و هەناسەدانەوە هەمیشە بەردەوامە بۆ بەردەوامی ژیان .

لەڕێگەی فەحسی خوێن دەتوانین ڕێژەی دوانۆکسیدی کاربۆن لەخوێندا بزانین ، بەرزی یان نزمی لە ڕێژەی دوانۆکسیدی کاربۆن نیشانە و دەرخەری گرفتی تەندروستییە.
ئەم فەحسە بەزۆری بەشێکە لە زنجیرە فەحسی ئەلیکترۆلایتەکان Electrolyte panel ، ئەلیکترۆلایتەکان یارمەتی هاوسەنگ ڕاگرتنی ترشێتی و تفتێتی لەشمان دەدەن ، زۆربەی ئەو دوانۆکسیدی کاربۆنەی کە لە لەشماندا هەیە بەشێوەی بیکاربۆنەیتە (Bicarbonate) ئەمەش بەشێکە لە ئەلیکترۆلایتەکان . ...

لەبەرئەوە ئەم فەحسە لەوانەیە هەندێ جار یارمەتیدەربێت لە دیاریکردن و تشخیص کردنی نەخۆشی و تێکچوونی پەیوەندیدار بە ناهاوسەنگی لە ئەلیکترۆلایتەکانی لەشمان وەک نەخۆشییەکانی گوورچیلە و نەخۆشییەکانی سییەکان و بەرزی پەستانی خوێن...

بۆچی گرنگ و پێویستە ئەنجامدانی ئەم فەحسە !! ( CO2 blood test)؟؟
زۆرجار کەسی پسپۆڕ ڕەچاوی ئەم فەحسە دەکات بۆ نەخۆش کاتێک نیشانەکانی ناهاوسەنگی لە ئەلیکترۆلایتەکانی لەش هەستی پێکرا ، هەندێک لە نیشانەکانیش بریتین لەمانە :-

- گرانبوونی هەناسەدان و هەناسە قورسی.
- لاوازی و شەکەتی و ماندوویی.
- ڕشانەوە یان سکچوونی درێژخایەن.

دەرئەنجامی ئەم فەحسە چییە؟
نائاسایی بوون لە دەرئەنجامی ئەم فەحسە دەرخەری ناهاوسەنگییە لە ئەلیکترۆلایتەکانی لەش ، یان بوونی کێشەیە لە کردنەدەرەوەی دوانۆکسیدی کاربۆن لەلایەن سییەکان.
بەرزی لەڕێژەی دوانۆکسیدی کاربۆن $CO_2$ لەخوێندا لەئەنجامی کۆمەڵێک حاڵەت ڕوودەدات لەوانە

- نەخۆشیی سییەکان.
- ناتەواوی لە ڕژێنی ئەدرینالین ، ئەم ڕژێنە شوێنەکەی لە لووتکەی گورچیلەکاندایە یارمەتی ڕێکخستنی لێدانی دڵ و پەستانی خوێن و هەندێک فرمانی دیکەی گرنگی لەش دەدات.
- نەخۆشی گوورچیلە.
- تێکچوونی هۆرمۆنی.
- کاتێک ڕێژەی تفتی لە خوێندا بەرز بێت. Alkalosis

کەمی لە ڕێژەی دوانۆکسیدی کاربۆن $CO_2$ لە خوێندا لەوانەیە دەرخەری یەکێک لەم حاڵەتانە بێت:
- حاڵەتی ئەدیسۆن ، لەم حاڵەتەدا ڕژێنی ئەدرینالین بڕی پێویست لەهۆرمۆنی پێویست بەرهەم ناهێنێت ، کە ئەمەش دەبێتە هۆی ڕوودانی چەند نیشانەیەک لەوانە -: سەرگێژی و وڕی ، کەمبوونی کێش ، ووشکبوونەوە.
- حاڵەتی Acidosis کە تێیدا ڕێژەی ترشی لەخوێندا بەرزە.
- حاڵەتی شۆک.
- نەخۆشییەکانی گورچیلە.
- هەندێ حاڵەت کە پەیوەندی بە جۆری یەکەم و دووەمی شەکرەوە هەیە...

---

## فەحسی گلوکۆز
## Blood Glucose Test

فەحسی گلوکۆز بریتییە لەپێوانی ڕێژەی گلوکۆز لە خوێندا ، گلوکۆز بریتییە لە جۆرێکی شەکر کە سەرچاوەیەکی سەرەکی ووزەی لەشە بەشێوەیەک کاتێک هۆرمۆنی انسولین یارمەتی جوڵاندنی گلوکۆز دەدات لەناو لوولەکانی خوێنەوە بۆ خانەکان ، بۆیە زۆری لەڕێژەی گلوکۆز لەخوێندا یان کەمی لەڕێژەکەیدا لە هەردوو بارەکەدا حاڵەتێکی نائاساییە و ئەگەری ڕوودانی حاڵەتی مەترسیدار لە تەندرووستی لەشماندا هەیە ، بەرزی ڕێژەی گلوکۆز کە پێی دەڵێین (Hyperglycemia) نیشانەیەکە یان دەتوانین بڵێین هۆکارێکی سەرەکی نەخۆشی شەکرەیە (Diabetes) ، نەخۆشی شەکرە مەترسیدارە و لەتوانایدایە ببێتە هۆی تووشبون بە نەخۆشییەکانی دڵ یان کوێربوون یان پەککەوتن و عجزی گورچیلەکان و چەندەها حاڵەتی دیکە.

هەروەها کەمی ڕێژەی گلوکۆز کەپێی دەڵێین (Hypoglycemia) ئەمەش ئەگەری ڕوودانی حاڵەتی مەترسیدار درووستدەکات بەتایبەت ئەگەر چارەسەر نەکرێت وەک تێکشکان و زیان بەرکەوتن بە مێشک.
بۆیە لەکاتی هەستکردن بە نیشانەکانی بەرزی یان نزمی ڕێژەی گلوکۆز پێویستدەکات ئەم فەحسە ئەنجامبدرێت، نیشانە باوەکانیش ئەمانەن :-

*نیشانەکانی بەرزی ڕێژەی گلوکۆز :-
- زیادبوونی تینوێتی.
- زوو زوو میزکردن.
- تەڵخبونی چاو و بینین.
- شەکەتی و ماندوویی.
- درەنگ چاکبوونەوەی برین.

*نیشانەکانی کەمی ڕێژەی گلوکۆز-:

- نیگەرانی و قەلەقی.
- ئارەقکردنەوە.
- لەرزین.
- سەرشێواوی.
- برسێتی.

هەروەها کاتێک مەترسی هەبوو بۆ تووشبون بە نەخۆشی شەکرە ئەوا پێویستە ئەم فەحسە ئەنجامبدرێت بۆ دڵنیابوون ، مەترسییەکانیش ئەمانەن :-

- قەڵەوی و زیادی کێشی لەش.
- کەمی چالاکی و وەرزشکردن.
- بوونی مێژوی خێزانی بۆ نەخۆشی شەکرە.
- بەرزی پەستانی خوێن.
- نەخۆشییەکانی دڵ.

هەروەها پێویستە لەماوەی قۆناغی دووگیانیدا فەحسی گلوکۆز ئەنجامبدرێت بەتایبەت لەنێوانی هەفتەی ٢٤ بۆ هەفتەی ٢٨ ی سکپڕی بۆ پشکنین بۆ ئەو جۆرە شەکرەیەی کە لەو ماوەیەدا ئافرەتانی دووگیان ئەگەری تووشبونیان هەیە کە ئەو جۆرە تایبەتەی شەکرە لەم ماوەیەدا ناودەبرێت بە (Gestational diabetes)

وا باشترە پێش ئەنجامدانی فەحسەکە بە هەشت کاتژمێر هیچ خواردن و خواردنەوەیەک نەخورێت.

دەرئەنجامی فەحسی گلوکۆز :-
ئەگەر لە ئەنجامی فەحسەکەدا ڕێژەی گلوکۆز بەرزتربوو لەڕێژەی ئاسایی خۆی ئەوا لەوانەیە مەترسی تووشبونت هەبێت بۆ نەخۆشی شەکرە ، هەروەها بەرزی ڕێژەی گلوکۆز هەندیک جار هۆکارەکەی یەکێک لەمانەیە :-
- نەخۆشی گورچیلە.
- بەرزی ڕژێنی پاراسایرۆید.
- هەوکردنی پەنکریاس یان شێرپەنجەی پەنکریاس.

بەڵام کاتێک ڕێژەی گلوکۆز نزمتربوو لەڕێژەی ئاسایی خۆی ئەوا لەوانەیە هۆکارەکەی یەکێک لەم حاڵەتانە بێت :-
- نزمی ڕژێنی پاراسایرۆید.
- بەرزی انسولین.
- نەخۆشی جـگەر.

لەگەڵ هەموو ئەوانەی کە باسمان کرد سترێس و نائارامی دەروونی و هەندێک جۆری دەرمان کاریگەری درووستدەکات لەسەر ڕێژەی گلوکۆز ، بۆیە پێویستە لەهەر حاڵەتێکی نائاساییدا سەردانی پزیشک بکرێت بۆ دڵنیابوون لە سەلامەتی تەندرووستی.
ڕێژەی ئاسایی بریتییە لە 3.9 - 5.5 mmol/L یان
(70 - 100 mg/dL)
ئەمە ئاسایی بۆ کەسێک شەکرەی نەبێت.

---

# BUN (Blood Urea Nitrogen)

فەحسی (BUN) زانیاری گرنگمان پێدەدات لەسەر فرمانی گورچیلەکان ، وەک دەزانن یەکێک لەفرمانە سەرەکییەکانی گوورچیلەکان بریتییە لە پاککردنەوە و کردنەدەرەوەی پاشماوە و فلودی زیادە بۆ دەرەوەی لەش ، کاتێک گورچیلە بەباشی ئەم فرمانە جێبەجێ نەکات بەهۆی نەخۆشی یان هەر ناتەواویەک لە گورچیلەکانماندا ئەوا ئەو پاشماوانە کەڵەکەدەبن و زۆردەبن لە خوێندا و ئەمەش هەڵی ڕوودانی نەخۆشی مەترسیدار دروستدەکات وەک : بەرزی پەستانی خوێن ، و نەخۆشییەکانی دڵ بەگشتی
...

لەڕێگەی ئەم فەحسەوە ڕێژەی (BUN) دیاریدەکرێت ، بۆزانیاریتان Urea Nitrogen بریتییە لە یەکێک لەو پاشماوانەی کە لەخوێندایە و لەڕێگەی گورچیلەکانەوە دەکرێتە دەرەوەی لەش ، هەر بۆیە ڕێژەی نائاسایی و بەرزی لە ڕێژەی ئەم فەحسە ئەوە نیشاندەدات کە گوورچیلەکان بەباشی فرمانەکانی خۆیان جێبەجێ ناکەن.

ئەگەر چی بەشێوەیەکی گشتی نەخۆشی گورچیلەکان لە سەرەتادا نیشانەیەکی دیار و ئەوتۆ هەست پێناکرێت بەڵام هەندێک هۆکار و فاکتەر هەیە کە مەترسی زیاتر دروستدەکات بۆ سەر گورچیلەکان لەوانە :-

- مێژووی خێزانی تووشبوو بە نەخۆشی گورچیلە.
- نەخۆشی شەکرە.
- بەرزی پەستانی خوێن.
- نەخۆشییەکانی دڵ.

سەرەڕای ئەوانە لە ستەیج و قۆناغەکانی دواتری نەخۆشی گورچیلەکاندا چەند نیشانەیەک بەدەردەکەون کەوا پێویستداکات ئەم فەحسە ئەنجامبدرێت ، هەندێک لە نیشانەکانیش ئەمانەن:

- زوو میزکردن.
- ئاوسانی دەست و قاچەکان.
- کێشە لە خەوتندا.
- خوران.
- تەشەنوجی ماسوولکەکان.

لەگەڵ هەموو ئەو حاڵەتانەشدا مەرج نییە هەموو کات بەرزی لە ڕێژەی ئەم فەحسە دەرخەری نەخۆشی گورچیلەکان بێت ، چونکە هەندێ هۆکار و حاڵەت دەبنە هۆی بەرزی لە ڕێژەی (BUN) لە فەحسدا لەوانە ، ووشکبونەوە ، سووتان ، هەندێ جۆری دەرمان....

ڕێژەی ئاسایی

7 to 20 mg/dLیان (2.5 to 7.1 mmol/L)

---

# فەحسی کالسـیـۆم
# Calcium Blood Test

کالسیۆم یەکێکە لەکانزا گرنگەکانی لەش گرنگ و پێویستە بۆ تەندرووستی ئێسک و ددان ، هەروەها کالسیۆم گرنگە بۆ باش بەڕێوەچوونی فرمانی دەمارەخانەکان و ماسوولکە خانەکان و دڵ ،نزیکەی لە 99% ی کالسیۆمی لەش لە ئێسکدایە و خەزنکراوە ، ئەوەی ماوەتەوە کە دەکاتە 1% لە سوڕی خوێندایە ، زیادبوون یان کەمبوونی ڕێژەی کالسیۆم لە خوێندا دەرخەری نەخۆشییەکانی ئێسک یان نەخۆشی غوددە یان نەخۆشی گورچیلە ، بۆیە لەڕێگەی فەحسی کالسیۆم لە ڕێگەی خوێنەوە ڕێژەی کالسیۆم دیاریدەکرێت.

ڕێژەی ئاسایی کالسیۆم9 - 10.5 mg/dL :

*نیشانەکانی بەرزی ڕێژەی کالسیۆم بریتیین لەمانە-:
- هێڵنجدان و ڕشانەوە.
- زوو زوو میزکردن.
- زیادبوونی تینوێتی.
- قەبزی.
- ئازاری سک.
- کەمبوونی ئارەزووی خواردن.

*نیشانەکانی کەمی ڕێژەی کالسیۆم-:
- تەشەنوجی ماسوولکە.
- گرژبوونی ماسوولکە.
- ناڕێکی لێدانی دڵ.

لەگەڵ ئەوانەشدا لە هەندێ کاتدا نیشانە دەرناکەون لەکاتی گۆڕانی ڕێژەی کالسیۆم ، بۆیە لەو حاڵەتانەی کە دەبنە هۆی گۆڕینی ڕێژەی کالسیۆم دکتۆر ئەم فەحسە دەکرێت ، حاڵەتەکانیش ئەمانەن
- نەخۆشی گورچیلە.
- نەخۆشی غوددە.
- هەندێ جۆری شێرپەنجە.
- خراپخۆری.

ئەنجامی فەحسی کالسیۆم:-

کاتێک ڕێژەی کالسیۆم زیاتربێت لە ڕێژەی ئاسایی خۆی ئەوا دەرخەری یەکێک لەم حاڵەتانەیە :-
-بەرزی ڕژێنی پاراسایرۆید، کاتێک ئەم ڕژێنە هۆرمۆنی زیاد بەرهەمدێنێت.

- نەخۆشی Paget's حاڵەتێکە دەبێتە هۆی نائاسایی بوون و لاوازی ئێسکەکان و زوو شکانی ئێسک.
- زۆر بەکارهێنانی دژە ترشەڵۆک کە کالسیۆم لە پێکهاتەی بێت.
- زۆر وەرگرتنی کالسیۆم بەهۆی دەرمانی ڤیتامین D یان شیر.
- هەندێ جۆری شێرپەنجە.

*بەڵام ئەگەر ڕێژەی کالسیۆم کەمتربوو لە ڕێژەیی ئاسایی خۆی ، دەرخەری یەکێک لەم حاڵەتانەیە:-
- نزمی ڕژێنی پاراسایرۆید، کاتێک ئەم ڕژێنە هۆرمۆنی کەم بەرهەمدێنێت.
- کەمی ڤیتامین.D
- کەمی ماددەی مەگنسیۆم.
- هەوکردنی پەنکریاس.
- نەخۆشی گوورچیلە.

*لەگەڵ ئەمانەشدا هەندێ دەرمان و تەنانەت خۆراکیش کاریگەری درووستدەکەن لەسەر ڕێژەی کالسیۆم.

---

## زەرعی بەکتریا
## Bacteria Culture Test

بەکتریا بەشێکە لە کۆمەڵەی زیندەیی ، بەکتریاکان لە شوێنە جیاوازەکانی لەشماندا دەژین کەهەندێکیان بێ زیانن یان تەنانەت سوودبەخشن ،ئەمە لە کاتێکدا هەندێکی دیکەیان دەبنە هۆی هەوکردن و نەخۆشی ، لەڕێگەی فەحسی زەرعی بەکتریا (Bacteria Culture Test ) دەتوانین بەکتریا مەترسیدار و زیانبەخشەکان دەستنیشان بکەین و بیان دۆزینەوە لەلەشدا ، لەماوەی فەحسی زەرعی بەکتریادا نموونەیەک وەردەگیرێت لە خوێن یان میز یان پێست یان هەر بەشێکی دیکەی لەش ، جۆری ئەم نمونەیەش پشت دەبەستێت بەو شوێنەی کە گومانی لێدەکرێت بۆ توشبونەکە.
خانەکان کە لەو نموونە وەرگیراوەدا هەن لە تاقیگەدا هەڵدەگیرێت و ژینگەیەکی بۆ دەڕەخسێنرێت بۆ گەشەکردن، ئەنجامەکەی بەزۆری لەبەردەستدا ئەبێت دوای چەند ڕۆژێکی کەم ، بەڵام گەشەی چەند جۆرێکی بەکتریا هێواش و لەسەرخۆیە بۆیە ماوەیەکی درێژتر دەخایەنێت.

بەکارهێنانەکانی زەرعی بەکتریا:-
زەرعی بەکتریا بۆ دیاریکردن و دۆزینەوەی جۆرەهای جیاواز لەو بەکتریایانە بەکاردێت کەدەبنە هۆی هەوکردن ، جۆرە باوەکانی زەرعکردن و بەکارهێنانەکەی بریتیین لەمانەی خوارەوە:-
- Throat Culture
بۆدیاریکردن و تشخیص کردن لە قورگ و لەوزەتێنەکاندا.

- Urine Culture
بۆ دیاریکردنی هەر هەوکردنێکی بەکتریایی لە ڕێرەوی میزەڕۆ.

- Sputum Culture
زەرعی بەڵغەم ، بە وەرگرتنی نمونەیەک لە بەڵغەم دەبێت بۆ دیاریکردنی هەوکردنی بەکتریایی و نەخۆشی لە ڕێڕەوی سیستمی هەناسەدان وەک.Pneumonia , Bronchitis

- Blood Culture
زەرعی خوێن ، بە وەرگرتنی نمونەیەکی خوێن کە بەزۆری لە خوێنهێنەری قۆل وەردەگیرێت ، بۆدیاریکردنی بوونی بەکتریا لە خوێندا.

- Stool Culture
زەرعی پیسایی ، بەوەرگرتنی نموونەیەک دەبێت لە پیسایی ، بۆ دەستنیشانکردن و دیاریکردنی بەکتریایی زیانبەخش کە بووبێتە هۆی نەخۆشی و هەوکردن لە سیستمی هەرسدا.

- Wound Culture
زەرعی شوێن برین یان سووتاوی ، بۆ دیاریکردنی هەوکردنی بەکتریایی لە شوێنی برینی کراوە و سووتاوی.

لە دەرئەنجامی هەریەکێک لەو زەرعانەی سەرەوەدا ئەگەر بەکتریا بوونی هەبوو ئەوا التهابات و هەوکردن بوونی هەیە ، هەروەها ئەم فەحسە یارمەتیدەرە لەجۆر و هەڵبژاردنی ئەو جۆرە دەرمانە دژە هەوکردنەی کە بۆ چارەسەری بەکاردێت.(Antibiotics)

---

# فەحسی ڕێژەی کلۆراید لە ڕێگەی خوێن
# Chloride blood test

ئەم فەحسە پێوانی بڕی کلۆرایدە لە خوێندا ، کلۆراید یەکێکە لە جۆرەکانی ئەلیکترۆلایتەکان ، ئەلیکترۆلایتەکان یارمەتی کۆنترۆڵکردنی بڕی شلە و فلوودی لەش دەدەن هەروەها هاوسەنگ کردنی ترشی و تفتێتی لەش ، ئەم فەحسە بەزۆری لەگەڵ ئەلیکترۆلایتەکانی دیکەدا ئەنجامدەدرێت بۆ دەستنیشانکردنی نەخۆشییەکانی گورچیلە و جگەر و عجزی دڵ و بەرزی پەستانی خوێن.

لە چ کاتێکدا ئەم فەحسە ئەنجامدەدرێت؟
کاتێک نیشانەکانی ناهاوسەنگبوونی شلە و ئاو و فلودی لەش دەرکەوت یان ناهاوسەنگی ترشی و تفتێتی ، نیشانەکانی ئەو حاڵەتانەش ئەمانەن-:
-ڕشانەوە بۆ ماوەیەکی زۆر
-سکچوون
-بێهێزی و لاوازی
-کێشەی هەناسەدان
-ووشکبونەوە

دەرئەنجامی ئەم فەحسە چییە؟
هەندێک هۆکار وادەکەن کە ڕێژەی کلۆراید ئاسایی نەبێت ، ئەم حاڵەتانەی خوارەوە هۆکارن بۆ بەرزی ڕێژەی کلۆراید:-
- ووشکبونەوە ، واتە کەمی شلە و ئاوی لەش.
- نەخۆشی گورچیلە
- ئەگەر ڕێژەی ترشێتی زیادبوو لە خوێندا کە هۆکارە بۆ دڵ تێکەڵهاتن و ڕشانەوە و لاوازی کە بەم حاڵەتە دەڵێین.Acidosis
- یان حاڵەتی Alkalosis کە تێیدا ڕێژەی تفتێتی لە خوێندا بەرزدەبێتەوە ، کە دەبێتە هۆی بێتاقەتییەکی زۆر ، کێشەی ماسولکەکان ، ....

کەمی لە ڕێژەی کلۆراید دەرخەری ئەم حاڵەتانەیە-:
- عجزی دڵ
- نەخۆشی سییەکان
- نەخۆشی ئەدیسۆن ، ئەم نەخۆشییە حاڵەتێکە کە تێیدا ڕژێنی ئەدرینالین بە ڕێژەیەکی تەواوەتی هۆرمۆن بەرهەم ناهێنێت ، ئەمەش دەبێتە هۆی دەرکەوتنی چەند نیشانەیەک لەوانە -:(لاوازی و گێژی و ووڕی ، کەمبوونی کێش ، ووشکبونەوە).

لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا مەرج نییە هەموو کات نائاسایی بوون لە ئەنجامی ئەم فەحسە دەرخەری نەخۆشی و ئەو حاڵەتانە بێت کە لەسەرەوە باسمان کردن بەڵکو کەم وەرگرتنی بڕی فلود و ئاوو یان زیاد وەرگرتنی هۆکارە بۆ گۆڕانی ڕێژەکەی ، هەروەها سکچون و ڕشانەوەی زۆر ، یان بەکارهێنانی هەندێ جۆری دەرمان وەک دەرمانی دژە ترشەڵۆکەکان antiacid ئەمانە توانای ئەوەیان هەیە ڕێژەی کلۆراید لە فەحسدا بگۆڕن..

تێبینی /ڕێژەی ئاسایی کلۆراید لە خوێندا ( 96 - 106.( mEq/L

---

# کریستال لە فەحسی میز
# Crystals in Urine test

میز لە چەندەها ماددەی کیمییایی پێکدێت ، هەندێک جار ئەو ماددەیە بەشێوەی تەنی ڕەق هەیە (Solids)کە ناودەبرێت بە کریستال ، لە فەحسی میزدا تێڕوانین دەکرێت لە بڕ و قەبارە و جۆری ماددە کریستاڵییەکە ، ئاساییە ئەگەر ڕێژەیەکی کەم لە کریستال لە میزدا بوونی هەبێت بەڵام کریستاڵی زۆر و گەورە یان هەندێ جۆری کریستاڵ هۆکارە بۆ درووستبونی بەردی گورچیلە ، بەردی گورچیلە تەنێکی ڕەقی شێوە ماددە لمییە کە دەبێتە هۆی لێدانی تووندی ئازار بەخش بە گوورچیلەکان.

فەحسی کریستال بەشێکە لە فەحسی شیکاری میز (Urinalysis) کە تێیدا پێوانەکردنی چەندەها ماددەی جیاواز دەکرێت لە میزدا ،هەندێ جار لەم فەحسەدا پشکنین دەکرێت لەڕێگەی بینۆکی Visualواتە لەڕێگەی بەکارهێنانی مایکرۆسکۆب بۆ بینینی قەبارە و ڕێژەی ئەو ماددە جۆراوجۆرانەی لەناو میزدا هەیە ، پشکنینی ماددەی کریستاڵیش دەتوانین بەرێگەی مایکرۆسکۆب پشکنینی بۆ بکرێت بۆ زانینی بوونی کێشە لە گورچیلەکان یان ناتەواوی کرداری میتابۆلیزمی ، لەکاتێکدا دکتۆر ئەم فەحسە بۆ نەخۆش ئەنجامدەدات بۆ تێبینی کردنی ماددەی کریستاڵی کاتێک نیشانەکانی بەردی گورچیلەی تێدا دەرکەوتبێت ، نیشانەکان ئەمانەن....

- ئازاری تووندی سک ، یان لا تەنیشتەکان و سەرەوەی ڕان.
- ئازاری پشت.
- بوونی خوێن لە میزدا.
- زوو زوو هاندان بۆ میزکردن.
- هەستکردن بە ئازار لەکاتی میزکردن.
- ناڕوونی و تەڵخبونی میز.
- دڵ تێکەڵهاتن و ڕشانەوە.

دەرئەنجامی بوونی کریستاڵ لە فەحسی شیکاری میزدا...

ئەگەر بەڕێژەیەکی زۆر و قەبارەی گەورە کریستال بوونی هەبوو یان هەندێ جۆری تایبەت ، ئەوا دەرخەری هەبوونی بەردی گورچیلەیە ، کە هەندێ جار پێویست بە چارەسەری پزیشکییانە دەکات ، لەگەڵ ئەوەشدا هەندێ جار پێویست بە دەرمان و چارەسەری پزیشکییانە ناکات ئەگەر قەبارەی بەردەکە بچووک بوو ئاسایی لە ڕێگەیی ڕێڕەوی میزکردنەوە دەکرێتە دەرەوە کە لەوانەیە کەمێک ئازاری هەبێت ، لەگەڵ ئەوانەشدا ئەنجامی ئەم فەحسە کاریتێدەکرێت بە خواردن و هەندێ دەرمان.

---

## فەحسی ڕێژەی کریاتین
## Creatinine level test

ڕێژەیی ئاسایی :
لە ئافرەتاندا 0.5 - 1.1 mg/dL
لە پیاواندا 0.6 - 1.2 mg/dL
گورچیلەکان کرداری پاڵاوتن ئەنجامدەدەن و پاشماوە بەرهەم دێت کاتێک ڕێژەی کریاتین بەرزبویەوە ئەوا مانای ئەوەیە کە کێشە و ناتەواوی لە فرمانی گورچیلەکاندا هەیە ، بۆیە لەکاتی ئەنجامدانی غەسلی گورچیلەکان پشت بەم فەحسە دەبەسترێت بۆ ئەوەی دیارییکرێت کە نەخۆش پێویستی بە غەسل دەبێت یان نا .

---

## ڤەحسی فۆسفۆڕ
## Phosphorus test

پێوانی ڕێژەی فۆسفۆرە لە خوێندا ، ڕێژەی ئاسایی فۆسفۆر لە لەشدا 2.4 - 4.1 mg/dL ، فۆسفۆر ڕۆڵێکی گرنگ دەبینێت لە تەندرووستی ئێسکەکان و ددانەکان هەروەها گرنگە بۆ گرژبوونی ماسولکە خانەکان و تەندروستی دەمارە خانەکان ، هەروەها پەیوەندیدارە بە ڕێژەی کالسیۆم ، زۆری لە ڕێژەی فۆسفۆر دەرخەری کێشەیە لە گورچیلەکان و ڕژێنی پاراسایرۆید ، چونکە فۆسفۆری زیادە لە ڕێگەی گورچیلەکان دەپاڵێورێ و دەکرێتە دەرەوە لە ڕێگەی میز ،

ئەو حاڵەتانەی کە دەبنە هۆی زیادبونی ڕێژەی فۆسفۆڕ (Hyperphosphatemia ) بریتییە لە :-
- بەکارهێنانی دەرمانی دژە ترشەڵۆک بۆماوەیەکی درێژ
- زیاد لە پێویست وەرگرتنی دەرمانەکانی Diuretics میزپێکەرەکان و ڤیتامین. D
- ناتەواوی سیستمی خۆراک.
- نەخۆشی و ناتەواوی گورچیلە و جگەر.

حاڵەتەکانی کەمی فۆسفۆر (Hypophosphatemia ) بریتییە لە-:
-بەرزی ڕێژەی کالسیۆم.
-کەمی ڤیتامین.D
-ناتەواوی سیستمی خۆراکی.
-زیاد دەردانی هۆرمۆن لەلایەن ڕژێنی پاراسایرۆید.

---

## ســـۆنەر (Ultrasound)

ســـۆنەر ( Ultrasound ) چییە ؟ سۆنەر یان Ultrasound هەروەها پێشی دەڵێن Sonogram : بریتییە لە فەحسێکی پزیشکی ئەنجامدەدرێت بە بەکارهێنانی شەپۆلی دەنگی بەرز بۆ بینین و پیشاندانی ئەندام و پێکهاتەکانی ناوەوەی لەش ، وە دیاریکردنی حاڵەت و کێشەی تەندروستی لەو ئەندامانەدا ئەگەر هەبێت.

سۆنەر بۆ چ مەبەستێک بەکاردێت ؟ دکتۆری پسپۆڕ بەکاریدێنێت بۆ بینینی دڵ و لوولە خوێنەکان بە بەکارهێنانی(Echo ، سۆنەری تایبەت بە دڵ) ، هەروەها گورچیلە و جگەر و ئەندامەکانی دیکە... ، هەروەها لە ماوەی قۆناغی دووگیانی بە کاردێت بۆ بینینی کۆرپەلە (Fetus) سۆنەر وەک ئەشیعە (X-ray) نییە چونکە تیشکدانی نییە ، لەبەر ئەم هۆکارەیە کە بۆ بینینی گەشەی منداڵ بەکاردێت لە ماوەی قۆناغی دووگیانیدا ، هەروەها ئەگەر ئازار یان ئاوساوی یان هەر حاڵەتێکی دیکە هەبێت لە ئۆرگان و ئەندامەکانی ناوەوەی لەشدا ئەوا زۆرجار سۆنەر بەکاردێت بۆ پشکنینی ئەو حاڵەتانە.

سۆنەر بەکاردێت بۆ پشکنینی ئەم بەش و ئەندامانەی لەش : (میزەڵدان ، مێشک لە منداڵاندا ، چاوەکان ، زراو ، گورچیلە ، جگەر ، پەنکریاس ، سپڵ ، منداڵدان ، لوولە خوێنەکان ، ڕژێنی غوددە ،..). لە ماوەی فەحسی سۆنەردا کەسەکە پاڵدەکەوێت لەسەر جێگایەک دکتۆرەکە ئامێرێک دەجوڵێنێت بەسەر بەشەکانی لەشدا بەو ئامێرە دەڵێین (Transducer) ، ئەو ئامێرە (Transducer) شەپۆلی دەنگەکە دابەش دەکات و بازدەدات و تێپەڕ دەبێت بۆ شانەکانی ناوەوەی لەش ، هەروەها ئەو ئامێرە (Transducer) شەپۆلە دەنگیە گەڕاوەکە دەگرێت ، ئامێری سۆنەرەکە وێنەیەک درووست دەکات لەو شەپۆلە دەنگیانە.



ڕەنگی جیاواز لە وێنەی سۆنەردا ئاماژەن بۆچی؟

زۆربەی وێنەی فەحسی سۆنەر بەشێوەی ڕەش و سپیە (White & Black) ، بەڵام دەتوانیت جیاوازی بکەی لە سێبەری ئەو ڕەنگە ڕەش و سپییەی کە لە وێنەکەدا هەیە ، بە شێوەیەک ڕەنگەکە جیاواز دەبێت و دەگۆڕێت بەپێی جیاوازی لە چڕی ئەو ناوەندەی کە دەنگەکەی پێدا تێپەڕدەبێت بەم شێوەیەی خوارەوە :

ئەگەر خانە یان شانەیەکی ڕەق بێت وەک ئێسک(Bone) ئەوا لە وێنەکەدا بە شێوەی سپی (White) دەردەکەوێت ، لەبەرئەوەی ڕوی دەرەوەی بەرپەرچی دەنگەکە زیاتر دەداتەوە ، سەیری وێنەی ژمارە (1) بکە.
ئەگەر شانەیەک بێت پێکهاتەی شلە ماددەی زۆربێت وەک منداڵدان (Uterus) ئەوا بەشێوەی تاریک دەردەکەوێت (Dark) ، دووبارە سەیری وێنەی ژمارە (1) بکە.
وێنەی سۆنەر بەشێوەیەکی باش ئیش ناکات لەسەر ناوەندی گاز ، لەبەرئەوە ئەو ئەندامەی کە پڕبێت لە هەوا و گاز وەک سییەکان (Lungs) ئەوا بەشێوەیەکی گشتی بە سۆنەر پشکنین و تشخیصی پێناکرێت.

ئەو نوسین و ژمارانەی لە بەشی سەرەوەی سۆنەردا هەیە ئاماژەیە بۆچی؟
زۆربەی نەخۆشخانەکان و سەنتەرەکانی پشکنینی سۆنەر بۆشاییەک بەکاردێنن لە سەرەوەی وێنەکەدا بۆ چەند مەبەستێک وەک ناوی کەسەکە و نیشاندانی ژمارەی نەخۆشخانە و چەند داتایەکی دیکە کە ئەمانە هیچ پەیوەندییەکیان نییە بە گرنگی پشکنینەکەوە بۆیە دەتوانین هیچ حسابێکیان بۆ نەکەین و گرنگ نین .

دیاریکردن و بینینی قۆناغەکانی گەشەی منداڵ لە ماوەی دووگیانیدا لە فەحسی سۆنـەر....

چۆن ڕووبەری منداڵدان و دیاریدەکرێت لە کاتی دووگیانیدا ؟

دەتوانین بەشی دەرەوەی منداڵدان دیاریبکەین لە وێنەی سۆنەردا بە دۆزینەوەی هێڵێکی ڕەنگ سپی یان خۆڵەمێشییەکی ڕوناک لە لێواری وێنەی سۆنەرەکە ، بەڵام تەنها کاتێک کە ناوەوەی ئەو هێڵە ڕووبەرێکی ڕەنگ ڕەش بێت کە ئەوەش بریتییە لە شلەی نێو منداڵدان (amniotic fluid) ، ئەگەر بیرتان بێت لە بەشی دووەم باسی ئەوەمان کرد کە ئەگەر شانەیەک بێت پێکهاتەی شلە ماددەی زۆربێت ئەوا بەشێوەی تاریک دەردەکەوێت (Dark) ، بەڵام ئەوە بزانە کە لێوار و قەراغی منداڵدان لەوانەیە کۆی گشتی هەموو وێنەکە نەگرێتەوە چونکە لەوانەیە ئەو کەسەی سۆنەرەکە دەگرێت (پسپۆڕەکە) شوێنی ئەو ئامێرەی کە دایدەنێ لەسەر سکی کەسەکە (Transducer) لە ناوەند داینەنێت ،بۆیە ئەگەر تەنها لە لایەک یان دوولای وێنەکەوە ڕەنگی سپی یان خۆڵەمێشیەکی ڕوناک بینرا ئەوا دەشێت ئەوە دیوی دەرەوەی منداڵدان بێت.
دیاریکردن و بینینی منداڵەکە لە ناو منداڵداندا:
منداڵەکەش زۆرجار ڕەنگێکی خۆڵەمێشی یان نزیک سپی دەنوێنێت لە ناو وێنەی سۆنەردا کە شوێنەکەی لەناو شلەی نێو منداڵداندایە (amniotic fluid) وەک ووتمان ئەم فلودە ڕووبەرێکی تاریک ئەنوێنێت لەناو منداڵداندا ، سەیری وێنەی ژمارە (1) بکەن..
ئەو ووردەکاری و گۆڕانکاریانەی کە دەیبینی لە ناو وێنەی سۆنەرەکەدا پشت دەبەستێت بە قۆناغ و ماوەی دووگیانییەکە ، بۆ نموونە : لەماوەی 8 هەفتەیدا منداڵەکە شێوەیەک دەنوێنێت ، وە لە ماوەی 12 هەفتەی قۆناغی دووگیانیدا لەوانەیە تەنها توانای ناسینەوە و دیاریکردنی سەری منداڵەکەت هەبێت ، ئەمە لە کاتێکدا کە لەماوەی 20 هەفتەییدا لەوانەیە توانایی دیاریکردن و بینینی بڕبڕەکان و دەست و قاچ و دڵ و چاوی منداڵەکەت هەبێت، سەیری وێنەی ژمارە (2) بکەن..
لە دەوروبەری 18 - 20 هەفتەییدا ئەوا دەتوانیت چاودێری گەشەی منداڵەکە بکەی لە سۆنەردا وە دیاریکردنی هەر کێشە و حاڵەتێک ئەگەر هەبێت ، هەروەها تێبینی کردنی ڕەگەزی منداڵەکە لەم ماوەیەدایە.

لە سۆنەردا چۆن وێنەکە دەگرێت ؟
دەستەواژەی سۆنەر یان Ultrasound ئاماژەیە بۆ ئەو دەنگەی کە مرۆڤ توانای بیستنی ئەو لەرەلەرەی نییە (Frequency) .کاتێک بۆ پشکنین و تشخیص بەکاری دێنین ئەوا لەرەلەری دەنگەکە لەنێوان 2 - 18 MHZ مێگا هێرتزدایە ، هەتا فریکوینسی دەنگەکە بەرزتر بێت ئەوا وێنەیەکی کوالیتی بەرزترمان نیشان دەدات بەڵام بەخێراتر و یەکسەری هەڵدەمژرێت لەلایەن پێست و شانەکانی دیکە بۆیە ناتوانێت بڵاوبێتەوە بە قوڵی وەک ئەوەی لە فریکوینسی نزمدا هەیە ، لەبەرئەوە ئەگەر دەنگەکە فریکوینسی نزمتر بێت ئەوا قوڵتر دەڕوات بەڵام کوالیتی وێنەکە زۆر باش نابێت.
بۆ نموونە کاتێک دەنگەکە بڕوات بە ناو خوێندا لە ژوورەکانی دڵدا کە گەیشتە زمانەکانی دڵ و بوو بە ڕێگرێک ئەوا دەنگ دەتاتەوە یان دەگەڕێتەوە دواوە لەو کاتەدا وێنەکە درووستدەبێت، یان ئەگەر نموونەیەکی دیکە باس بکەین ئەگەر بۆ زراو بەکاریبهێنین ئەوا دەنگەکە ڕاستەوخۆ دەڕوات ئەگەر هیچ بەردێکی زراو بوونی نەبێت بەڵام ئەگەر بەردی زراو هەبێت ئەوا دەنگەکە دەگەڕێەتەوە و وێنەکە لەوکاتەدا درووستدەبێت.

سۆنەر بەکاردێت بۆ دیاریکردنی هەوکردنی زرا و بەردی زراو ، هەروەها لەکاتی هەوکردن و هەڵئاوسانی ڕیخۆڵە کوێرەشدا بەکاردێت بۆ پشکنین ، بەڵام بوونی گاز و چەوری لە ڕیخۆڵەکان زۆرجار دەبێتە هۆی بلۆککردنی شەپۆلی دەنگەکە و پشکنینەکە قورستر دەکات.
بەکارهێنانی سۆنەر بۆ منداڵی بچووک :

لە منداڵی بچوکدا سۆنەر بەکاردێت بە دانانی ئامێرەکە لەسەر بەشێکی سەری منداڵەکە ، دەتوانین پشکنینی هەر حاڵەتێکی نائاسایی بکەین کە لە مێشکیدا هەبێت.

هەروەها سۆنەر لە بواری بەنجکردنیشدا بەکاردێت وەک ڕێبەرییەک کاتێک دکتۆری بەنجەکە دەرزیەک لە دەرمانی سڕکردن دەدات لەنزیک شوێنێک کە دەمارە خانەیەی لێبێت Nerve.لەحاڵەتی تەواری و ئیمێرجینسیشدا بەکاردێ بۆ چەندەها حاڵەت وەک لەکاتی ڕوودانی حادسەیەکی قورسدا ، هەروەها کۆبونەوەی فلود لەدەوری دڵ ..هتد..

---

## سـۆنــەری دڵ

...Echocardiography
ئەم فەحسە بەکاردێت بۆ زانینی چۆنێتی ئیشکردنی ماسوولکە خانەکانی دڵ بۆ پاڵنان و پەمپکردنی خوێن بۆ بەشە جیاوازەکانی لەش ، بەزۆری بەکاردێت بۆ دیاریکردن و پشکنین لەکاتی کەم ڕۆشتنی خوێن لە لوولەخوێنەکانی دڵ بەهۆی تەسکبوونەوەیان.
چۆنێتی ئەنجامدان و تەکنیکی ئەم فەحسە لەکاتی ڕێست:
تەکنیکی ئەنجامدانی وا پێویستە کە کەسەکە لەسەر لای چەپ پاڵبکەوێت و دەستی چەپی بێنێتە دەر ، پاشان ئامێرێکی بچووک کە ناودەبرێت نە (transducer) لەسەر سنگی ڕادەگیرێت و دەجوڵێنرێت کە بۆ تێگەشتن بە نزیکەیی وەک ماوسی کۆمپیوتەر وایە ، هەروەها لەکاتی ئەنجامدانیدا جێڵێکی تایبەت بەکاردێت بۆ ئەوەی ئەو شەپۆلانە بەشێوەیەکی باش بگات بە دڵ و ژوورەکانی دڵ.

لە زۆربەی حاڵەت و کەیسەکاندا وا پێویست دەکات کەسەکە بۆماوەی ٥ بۆ ١٠ دەقیقە بڕوات یان لەسەر ئامێری بایسکیل ئەمەش ڕێژەکەی بەپێی تەمەنی کەسەکە ، پاشان دکتۆرەکە ئاماژە بە ڕاگرتن و وەستان لەو کردارە دەکات کاتێک :
- کاتێک لێدانی دڵ گەیشتە ئەو ڕاددەیەی کە دکتۆر ئامانجییەتی کە ئاساییانە زیادبوونی لێدانی دڵە.
- یان کاتێک ماندوو بویت لە دووبارەکردنەوەی ئەو کردارە.
- ئەگەر ئازاری سنگ یان گۆڕانکاری لە پەستانی خوێن ڕوویدا
ئەگەر کەسەکە توانای ئەو وەرزشکردنەی نەبوو ئەوا دەرمانێکی پێدەدرێت لەڕێگەی خوێنهێنەر (Vein) ، وەک دەرمانی Dobutamine ،ئەم دەرمانە لێدانی دڵ خێراتر و قورستر دەکات بە هەمان شێوەی ئەو کاتەی کە وەرزشەکە دەکەیت .پێویستە پەستانی خوێن و ریتمی دڵ (ڕێکی و ناڕێکی لێدانی دڵ) چاودێری و مۆنییەر بکرێت لەکاتی ئەنجامدانی ئەم کردارەدا .



زۆرینەی ئەو وێنەیەی لە سۆنەری دڵ کە دەگیرێت لەو کاتەدایە کە لێدانی دڵ زیاد دەبێت یان ئەو کاتەی کە دەگاتە لووتکە ، واتە وێنەکە درووست دەبێت لەکاتێکدا کە هەر خانەیەک لە ماسوولکەخانەکانی دڵ بەباشی ئیش نەکەن لەوکاتەی لێدانی دڵ زیاد دەبێت ، ئەمەش نیشانەی ئەوەیە کە بەشێک لە خانەکانی دڵ بەباشی ئۆکسجینی پێویستی پێناگات بەهۆی تەسکبوونەوە یان گیرانی لوولە خوێنەکان.



---

اشیعەی تەنووری دڵ :: (Cardiac MRI)

فەحسێکی وێنەی بێ ئازارە ، کە تێیدا شەپۆلی ڕادیۆی و موگناتیس و هەروەها کۆمپیوتەر بەکاردێت بۆ دروستکردنی وێنەیەکی وورد و پڕ زانیاری دەربارەی تەندرووستی دڵ (Heart) ، یارمەتی دکتۆر دەدات لە دەستنیشانکردنی نەخۆشی و ناتەواوی دڵ هەروەها توندییەکەی وەک ئەم حاڵەتانەی خوارەوە :-

- نەخۆشی بۆرییە خوێنەکانی دڵ
- بوونی کێشە لە زمانەکانی دڵ (Heart valves problems)
- هەوکردنی پەردەی دڵ
- وەرەمی دڵ
- زیان بەرکەوتووی دڵ بەهۆی جەڵدە اشیعەی تەنووری MRI ئامێرێک وەک تونێلێکی گەورەیە ، نەخۆش پاڵدەکەوێت لەسەر جێگەکە بەشێوەیەکی نەجوڵاو پاشان تێپەڕ دەکرێت بەناو ئامێرەکە ، لەڕێگەی دەرکردنی دەنگێک و ژاوەیەکی بەرزەوە وێنەکە دەگیرێت ، بەزۆری ئەم کردارە 30 - 90 دەقیقە دەخایەنێت ، هەندێک جار پێش ئەنجامدانی فەحسەکە بۆیە بەکاردێت بۆ ئەوەی لەکاتی دروستبوونی وێنەکە دڵ و بۆرییە خوێنەکانی دڵ بە شێوەیەکی جوان و ڕووناکتر دەربکەون.

